یەکەمین گۆڤاری کارگێڕیو گەشەپێدانی مرۆیی لە کوردستاندا!




دیاری گروپی کۆمپانیاکانی ڕەسەن

ساڵی حەوتەم
74
ئابی ٢٠١٤

لە پێناو گەلێکی خاوەن بڕیاردا

# بڕیار



مانگانەیەکی تایبەتە بە کارگێڕیو گەشەپێدانی مرۆیی

## ئادابی ئەوین

## لەگەڵ سەیدی شاعیردا

## خۆت بڕیار بۆ ئایندەت بدە!

## منداڵ بەخششی خوایە

## ملوانکەی مرواری!

## چیرۆکی یوتیوبو سیکوچکەی داهێنەرانی

## هێرشی کەرویشکەکان!

**ئەوکەسەی بەبەرچاوییەوە، سوکایەتی**
**بە مرۆڤێك دەکرێتو بەڵام ئەو**
**هەست بەو سوکایەتییە ناکات..**
**هەرگیز ئازاد نییە!!**

نیلسون ماندیلا



# No:74


**ڕاوێژکاری یاسایی**

پارێزەر:- ئازاد محیّدین

**بەشی هونەرىو دیزاین**

پشتیوان عبدالرحمن

**تایپ**

کلسوم جەلال

**ناونیشانی گۆڤار**

سلێمانی - شەقامی سالم -تەلاری جەمالی حاجی عەلی-
نهۆمی چوارەم- یەکەی (٤٠١) نزیك پردی خەسرەو خاڵ
٠٧٤٨٠١١٢٧٨٧ - ٠٧٧٠٢١٧٨٦٨٢

هەولێر
٠٧٥٠٤٤٦٣٢٣٠ - ٠٧٥٠٠٥٢٥٣٠٣٥

E-mail: bryarmagazin@gmail.com


bryarmagazine

دابەشکردن: کۆمپانیای پەیك
07708649210

چاپ: کۆمپانیای پیرەمێرد

**خاوەنی ئیمتیاز**

ئەندازیار:
مەسعود تاهیر ڕۆژبەیانی

**سەرنووسەر**

عادل محەممەد شێخانی
sarnosar@yahoo.com

**بەڕێوەبەری نووسین**

بەرزان ئەبوبەکر

**دەستەی نووسەران**

ئەسکەندەر ڕەحیم
بێگەرد فارس
زاهیر زانا
گوڵان حەمەئەمین
محەممەد مێرگەیی
محمد هاشم محمد
وەهاب حەسیب
یەحیا محەممەد

نرخ 2500 دینار







مانگانەیەکی تایبەتە بە کارگێڕیو گەشەپێدانی مرۆیی
ساڵی حەوتەم - ژمارە 74 - ئابی 2014

# کارگێڕیو بازاڕسازی























# خۆت بڕیار بۆ ئایندەت بدە!

هەموو سـالێك لەم كاتەدا، خوێندكارانی پۆلی (١٢)، دەكەونە دڵەڕاوكێو تووشـی نیگەرانی دەبن، دوای ڕۆژانێكی سەختو دژوار لە تاقیكردنەوەو خوێندنو موتاڵاكردنی وانەكان، زۆر بە خەستو خۆڵیو ترس لـە ئەنجامو نمرەی تاقیكردنـەوەكان. وێڕای ئەمە جارێكی دی مەسەلەی هەڵبژاردنی كۆلێژو قۆناغی نوێی خوێندن، گرفتێكی گەورەیە!

زۆرجار دەستێوەردانی خێزانو دەوروبەر، گرفتەكە گەورەترو دۆخەكە ئاڵۆزتر دەكات!

هەڵبەت، هۆكار زۆرن بۆ دروسـتبوونی ئەم دۆخە نادروستەو سەرسوڕمانی خوێندكار، لە هەڵبژاردنی پسپۆڕی زانكۆیی!

كە گرنگترینیان ئەوەیە، خوێندكار هێشتا خۆی نەدۆزیوەتەوەو نازانێت: كێیەو چییەو چی دەوێت! لە ژیانداو ئامانجی چییە؟!

دەكرێ هەندێجار، نمرە ئایندەت بۆ دیاری بكات!

نمرەی بەرزی زانستی، بۆ پزیشكیو وێژەیش، بۆ یاسا!

چونكە دەكرێ ژیانی بەزایە دا، بەڵام نمرەكانی، نا!

وەلـێ مرۆڤـی زیرەكو ژیـر، ئایندەی خۆی بـەلاوە گرنگەو ناهێڵێ كەس، لەبری ئەو، بڕیار بدات.

دەبێت خوێندكاری زیرەكو بە توانا، پێشتر ئارەزووی هەبێت، بۆ كۆلێژێك، كە هەڵیدەبژێرێت.

ئامانجی هەیە لەو كارەیدا، پەیامی هەیە بۆ ژیانو مرۆڤایەتی. لەوێدا، بەردی بناغەی كارێكی پیرۆز دادەنێت.

قۆناغی زانكۆ بەهاری تەمەنە، هەسـتیارترین قۆناغی ژیانە، ساتەوەختی دۆزینەوەی خودو كامڵبوونی كەسێتییە!

بزانـە بەختەوەریی تۆ، لە چیدایـە، لە چیی بوارێكدا، خۆت دۆزیوەتەوە، ئـارەزووت لە چییە، لە چیدا گوڵزاری تەمەنت، والا دەكەیت؟

ئەمە بڕیاری چارەنوسـی خۆتە، تۆ لە زانكۆ، ئاراستەی ژیانو ئاینـدەت دیاری دەكەیت، ناكـرێ ئەم بڕیارە چارەنوسسـازە، بە كەسێكی دی بسپێریت!

لەو قۆناغەدا نەخشەو پلانی ژیانت دادەنێیتو هێڵە گەورەكانی ژیانـت دیـاری دەكەیت، لەوێوە بـەرەو دڵنیایـیو جێگیربوونو بیركردنەوە لە هەموو وردەكارییەكانی ژیان دەڕۆیت!

ناكرێ سبەی، بەهۆی كاریگەریو هەڵبژاردنی دەوروبەرەوە لە شوێنێك خۆت ببینیتەوە، كە هیچ ئارەزووی ناكەیت!

ئەوسـا تووشـی بێهیواییو بێزاربوون لە ژیـان دەبیتو ژیان بەهایەكی ئەوتۆی نامێنێت لات!

تەنها ڕۆژەكان بەڕێ دەكەیت! جوانیەكانی ژیان نابینیت!

ڕەنگە ئاڵو والاكانت، لا كاڵ دەبنەوە!

نـا، خۆت بڕیاری ژیانی خۆت بدە، نمرەكانت داهاتووت دیاری ناكەن! كۆلێژی بەناوبانگ، پێگەی كۆمەڵایەتی!

ئەمانە كامەرانیی تۆ، دروست ناكەن!

ئـارەزووی كوێ دەكەیت، دەتەوێت ببیـت بە چی، خەون بە چییەوە دەبینیت، شوێنی ئەوانە بكەوە!

خەونەكانت بهێنە دی، با ژیانت جوانترو ئایندەت لە ئێسـتا، زۆر خۆشتر بێت!!

# کارگێڕی بە گوفتار

شکست بە شەرەفمەندییەوە، باشترە لە سەرکەوتن بە فێڵو تەڵەکەوە!

سوفوکلیس

مەبە بەو کەسانەی کە بە گوێچکەکانیان، یان ورگیان، یاخود گیرفانیان بیردەکەنەوە!

نەزانراوە

ئێمە شێتین ئەگەر نەتوانین بیربکەینەوە، دەمارگیرین ئەگەر نەمانەوێت بیربکەینەوە، کۆیلەین ئەگەر نەوێرین بیربکەینەوە.

ئەفلاتون

تۆزو خۆڵی کارکردن، باشترە لە زەعفەرانی تەمەڵی..

لابرووێر

قسەکردن بێ بیرکردنەوە، وەك تفەنگ نانە بە تاریکییەوە.

سرڤانتس

# شکست + تێگەیشتن = سەرکەوتنی مسۆگەر

لە چاوپێکەوتنێکی ڕۆژنامەوانیدا، ڕۆژنامەنووسێك پرسیاری لە بەڕێوەبەری بانکێك کرد: نهێنی سەرکەوتنت، بۆچیی هۆکارێك دەگێڕیتەوە؟!

بەڕێوەبەر گوتی: تەنها بە دوو وشە، وەڵامت دەدەمەوە، بەهۆی بڕیاری ڕاستو دروستەوە!

ڕۆژنامەنوسەکە، دووبارە پرسی: ئەی چۆن دەتوانیت هەمیشە، بڕیاری سەرکەوتوو بدەیت؟

بەڕێوەبەرەکە گوتی: ئەم پرسیارەشت، بە وشەیەك وەڵام دەدەمەوە، ئەمە ئەزموونە!

جارێکی دی، ڕۆژنامەنووسەکە پرسی: ئەی چۆن توانیت، ئەم ئەزموونە گەورەیە بەدەست بهێنیت؟!

بەڕێوەبەر گوتی: دووبارە دوو وشە، وەڵامی ئەم پرسیارەیە، ئەویش «بڕیارە هەڵەکان»!

## لەم چیرۆکەوە فێردەبین:

١. بڕیاردان، گرنگترین پێویستییەکانی ژیانی مرۆڤە.

٢. سەرکەوتن، بێ بڕیاری سەرکەوتوو، هەرگیز ڕوو نادات.

٣. ئەو مرۆڤەی لە شکست بترسێت، ناتوانێت هەرگیز بڕیار بدات.

٤. هەڵەکردن لە بڕیاردا، هەڵە نییە.. بەڵام بڕیار نەدان، گەورەترین هەڵەیە.

٥. ئەزموون، ئەنجامی هەڵەو شکستە، هەرگیز بێ هەڵەکردن، ئەزموون دروست نابێت.

٦. ئەوەی هەڵە نەکات، نە هەڵە دەناسێتو نە پێچەوانەکەشی!

٧. ئازا بن بڕیار بدەنو مەهێڵن کەس لە ژیانداْ، لەبری ئێوە بڕیار بدات، دڵنیا بن سەردەکەون!



# تەنها بۆ سەرکردەکان

گەر ناتەوێت سەرکردە بیت، ئەم لاپەڕەیە مەخوێنەرەوە!

سەرکردایەتی تەنها قسەکردن نییە، بەڵکو هەڵسوکەوتوو کردارە!

هارۆلد جێنین

سەرکردە مەزنەکان لە دەروونی شوێنکەوتوانیاندا باوەڕ بە ڕابردوو، کارکردن لە ئێستادا، هیوا بۆ ئایندەیەکی باشتر دەچێنن!

هارۆلد سیمۆر

سەرکردایەتی بریتی نییە لەوەی کە خەڵکی خۆشیان بووێیت، بەڵکو ئەنجامدانی کاری دروستو بەجێیە!

روبن شارما

جیاوازی لە نێوان سەرکردەو شوێنکەوتوودا، بریتیە لە داهێنان!

ستیف جوبس

بەڕێوەبردنی کۆمپانیایەك لە بەڕێوەبردنی خودی خۆتەوە دەست پێدەکات، ناتوانیت لەکاردا گەورەو لێهاتوو بیت، تەنها ئەو کاتە نەبێت کە هەست بە گەورەیی خۆت بکەیت!

روبن شارما

بەشی یەکەم

ئا: خەندە عوسمان کەریم



## دیدارێك لەگەڵ پرۆفیسۆری یاریدەدەر، بەڕێز: د. ئازاد حمە ئەحمەد شێخانی

# دەربارەی پلاندانانی شارو هەرێم

**پلان چییەو کەی سەری هەڵداوەو مێژووی پلاندانان لە عێراقدا، بۆ کەی دەگەڕێتەوە؟**

پلان پرۆسەیەکی بەردەوامە، کە مرۆڤ لە هەموو کاتو ساتێکی ژیانی خۆیدا،بۆ ڕێکخستنی ژیانی، بەکاری دەهێنێت. مانا زانستییەکەی ئەوەیە، کە پلان دادەنێیت، مانای وایە بۆ دوارۆژی خۆت، یان شارەکەت بەرەو چ ئاقارێك دەبەیت.. پلاندانان لە دێرزەمانەوە، بوونی هەبووە. لەگەڵ دروستبوونی شارەکاندا، پلان هەر هەبووە، بەڵام بەو مانا زانستییە نەبووە، لە کۆتایی سەدەی ١٨، دوای شۆڕشی پیشەسازی، بۆ ڕێکخستنی شارەکانیان، پلاندانان لە ئەوروپا هاتە کایەوە. ئەم بیرۆکەیە، لەم وڵاتانەی لای ئێمە، لە دوای جەنگی جیهانیی دووەم، بەتایبەتی لە عێراقدا، لە شەستەکاندا بیرۆکەی پلاندانان، یان وشەی پلاندانان جێگای خۆی کردەوە؛ پلانی نیشتمانییان پێ دەوت، لە دوای جەنگی جیهانیی دووەمەوە، لەسەر ئاستی دەوڵەت، پلان بۆ کەرتە ستراتیجییەکان، دادەنرا.. بۆئەوەی دایبمەزرێنێتو دروستی بکات. هەرچەندە تازە لە عێراقدا، وەزارەتێك هەبوو بە ناوی (وەزارەتی پلاندانان) لە بەغداد، لە دوای پرۆسەی ئازادی ساڵی (٢٠٠٣)، وەزارەتی پلاندانان لە عێراقدا دروست بووە. لە کوردستان وەزارەتی پلاندانانیان دانایەوە، بەڵام دوای چوار ساڵ وەزارەتەکە نەما، لەبەر چەند هۆیەکی کارگێڕی، کە زۆر بە گرنگیان دانەدەنا، هەرچەندە کارەکەیان زیاتر کۆکردنەوەی داتاکان بوو، لەسەر کەرتی (ئابوری، کشتوکاڵی، پیشەسازی، دانیشتووان) داتاکان دادەنرانو بەڵام هیچ کارێکی گرنگی، پێ نەدەکرا وەکو پلاندانان، مەگەر جارجار شتێکی بچکۆلەی پێ بکرایە، کە لە ڕاستیدا پلاندانان، تەنها کۆکردنەوەی داتا نییە، بەڵکو دارشتنی بەرنامەیەکە، بۆ وڵاتەکەت بۆ پێنج ساڵی داهاتوو. بۆ نموونە:- وەزارەتەکانی تر ڕێك بخات، بۆ نموونە کەرتی کشتوکاڵی لاوازە، وەزارەتی پلاندانان دەڵێت: بودجە پێویستە، بۆئەوەی کەرتەکە بەهێز بێت، لەدوای سەرۆکایەتیی ئەنجومەنی وەزیران، وەزیری پلاندانانە وەکو باڵادەستو بڕیاردەر، لێرەدا، ئەوەی ئێمە زیاتر مەبەستمانە، ئەو پلانە نیشتیمانیو ئابوورییانە نییە، کە لەسەر ئاستی حکومەتە، بەڵام پلاندانان لەسەر ئاستی شارو هەرێم، ئەمە بابەتی سەرەکیمانە.

**تەکنیکەکانی پلاندانان چیین؟**

بەگشتی پلاندانان لە عێراقدا، لە ساڵانی ڕابردوودا، بەمشێوەیە بوو:- چەند ئەندازیارێك لە هۆڵێکدا دادەنیشتن لە شارەوانی بووایە، یان لە پارێزگا، دیزاینی شارەکەیان دەکرد بۆ (٢٥) ساڵی داهاتوو، بەڵام بەبێ ڕەچاوکردنی کۆمەڵێك فاکتەر، کە ئەم ئەندازیارانە، خۆیان پسپۆڕی پلاندانان نیین، بەڵکو ئەندازیاری (مەدەنیو تەلارسازی)ین، پلاندادەنێن، کە پلاندانان پرۆسەیەکی زۆر ئاڵۆزە، لە کۆمەڵێك قۆناغ پێکهاتووە، کە پێنج قۆناغ دەگرێتەوە:-

**قۆناغی یەکەم:** بریتییە لە کۆکردنەوەی داتا، لەسەر هەموو بوارەکان. وەکو (خانووبەرە، کەرتی تەندروستی، کەرتی پەروەردە، هاتوچۆ، کارەبا، ئاوو ئاوەڕۆ،......) دەبێت داتات لەسەر هەمووی هەبێت، حاڵی ئێستات چۆنە، پاشان شیکردنەوەی بۆ دەکەیت.

**قۆناغی دووەم:-** شیکردنەوەی داتاکانە، بۆ نموونە لە قوتابخانەیەکدا، چەند خوێندکاری تێدایە، لە پۆلێکدا چەند خوێندکار کەمە، یان چەند زیادە، لە بنکە تەندروستییەکاندا، پزیشکێك چەند هاوڵاتی بەردەکەوێت؛ بە پێی یاسای عێراقی بێت، هەر (١٠٠٠) کەسێك سێ پزیشکی بەردەکەوێت، ئایا تۆ هەتە یان نیتە، دەبێت پلاندابنێیت، بۆئەوەی هەتبێت، یان قەرەوێڵەی نەخۆشخانە، چەندت هەیە لە شارەکەدا، ئایا ئەوەی هەیە، بەشی

ئەو خەڵکە دەکات، کە لە شارەکەتدا دەژین، ئەگەر کەمە دەبێت پلانی بۆ دابنێیت، پڕی بکەیتەوە. لە هەموو بوارەکاندا، چەند کیلۆوات کارەبا هەیە بۆ شارەکەت، کە شارەکەت گەورەتر بوو، دەبێت چەند کیلۆواتی تر دروست بکەیت بۆ داهاتوو، نابێت تەنها پشت ببەستریت بەوەی کە هەیە، ساڵ بە ساڵ دانیشتووان زیاد دەکات، کە زیادیکرد، پێویستی بە زەوی هەیە، بۆ خانووبەرە، پێویستی بە کارەباو ئاوو خزمەتگوزاری هەیە. پلان ئەمەیە بیر لە (٢٥) ساڵی داهاتوو بکەیتەوە، نەك تەنها پێویستیی ئێستا، دەبێت بیر لە پێویستیی داهاتووش بکەیتەوە.

قۆناغی سێیەم:- لەم قۆناغەدا، کە پلاندادەنێیت، دەبێت چەند پلانێك دابنێیت، لانی کەم سێ پلان، ئەم پلانانە، دەبێت لەگەڵ هاوڵاتیانو لایەنە پەیوەندیدارەکاندا، وتووێژی لەسەر بکرێت، لەگەڵ کەلتوری وڵاتەکەی تۆدا، کامیان باشترەو گونجاوترە.. کامانەیان ستاندەرە نێودەوڵەتییەکانیان هەیە، پاشان بۆت دەردەکەوێت، کام لە پلانەکان، بۆ تۆ باشە. ئینجا ڕەشنووسێك دروست دەکەیت.

قۆناغی چوارەم:- ئەم ڕەشنووسە کە هەیە، شتێکە ناکامڵە، هێشتا دەچێتە بواری وتووێژەوە، لەگەڵ لایەنی پەیوەندیدارو جەماوەردا، هەتاکو تۆکمە دەبێتو دەزانرێت ئەو پلانەی داتناوە، بەڕاستی پێداویستیی خەڵك، پڕدەکاتەوە.

قۆناغی پێنجەم:- کۆتا قۆناغە، ماستەرپلانی کۆتاییش، دیسانەوە دەبێت هەڵبواسرێتەوە، لانی کەم بۆ ماوەی مانگێك، بۆئەوەی خەڵکی ڕاو سەرنجی خۆی بدات. ئینجا دوایی پەسەند دەکرێت، لەلایەن وەزارەتەوەو دەبێت بە دەستورێك بۆ شار، چۆن مامەڵە بکات، لە ساڵانی داهاتوودا، هەر لە ناو پلانەکە قۆناغی جیاواز هەیە؛ کورتخایەن بۆ پێنج ساڵی یەکەم، مامناوەند بۆ پانزە ساڵی دووەم، بۆ بیستو پێنج ساڵی داهاتوو، درێژخایەنی پێدەگوترێت. بۆ هەر یەکێك لەمانە، دەبێت پێداویستییەکان، هەر لە ئێستاوە دابین بکرێت، ژمارەی دانیشتوان دەبێت بە چەند، ئایا دەبێت چەند خانووی بۆ دروست بکەم، چەند ڕێگاوبانیان بۆ دروست بکەم، چەند کارەبایان بۆ بهێنمو چەند ئاویان بۆ دابین بکەمو چەند ناوچەی پیشەسازیو بازرگانییان بۆ دروست بکەم، هەروەها بۆ پانزە ساڵو بیستو پێنج ساڵی داهاتوو، ژمارەی دانیشتوان، دەبێت بە چەند، سنورەکەی دیاری دەکەمو پێداویستیەکانیشیان ئەمەیە، بەم شێوەیە وڵات بەڕێوە دەبرێت بە پێی پلان.

**ئایا پلاندانان تەنها دیزاین کردنە، یاخود کۆمەڵێك پسپۆڕی دیکەش لەخۆی دەگرێت؟**

لە ناو پلاندانانداندا، پسپۆڕیی جیاواز هەیە، تەنها دیزاین نییە. ئێستا بۆ نموونە پلاندانانی ژینگەیی هەیە، لە حەفتاکانەوە لە ئەورووپا کاری پێدەکرێت، زۆربەی ئاڕاستەکانی پلاندانانیش، ئێستا بەرەو ئەو ئاڕاستەیە دەبێت، شتێك دروست بکەیت sustainable بێت، واتای ئەمە ئەوەیە، تۆ شارێك دروست بکەیت، کە بتوانێت لە سەر پێی خۆی بوەستێتو پشت بە دەرەوە، یان کەرتێك نەبەستێت، بیژێنێتو ئەو خاكو کەرستانەی کە هەتە، وەکو خۆی دروستی بکەیتەوە، بەبێ ئەوەی زیانی لێ بدەیتو کاربکاتە سەر ecosystemی ئەو شوێنە، وەکو پرۆسەی دووبارە بەکارهێنانەوەی ئاو، ئەگەر گرفتی ئاوت هەیە، ئەو ئاوە نابێت هەروا بەهەدەر بڕوات، پێویستە جارێکی تر بەکاربهێنرێتەوە، بۆ خواردنەوە بۆ باخچە بۆ زۆر شتی تر، هەروەها لە بواری هەوادا، ئەو هەوایەی ئێمە، زۆر زۆر پیسە. ئەوەندەی ئۆتۆمبێل هێنراوەتە ئەم وڵاتەوە، هیچ گواستنەوەیەکی گشتی بوونی نییە، ئەمە کارەساتە بۆ نموونە: تا ساڵی ٢٠١٢، نزیکەی ملیۆنو نیوێك ئۆتۆمبێل، هاتۆتە ئەم هەرێمەوە. بێگومان زۆرتریشە کە ئەمە فورقوشم فڕێدەداتە دەرەوەو ماددەی زیانبەخشی تر، کە زیان بە هیمۆگلۆبینی خوێن دەگەیەنێت، کە توشی کۆمەڵێ کێشەی تەندروستیت دەکات. لە هەمان کاتیشدا بۆ خۆراك کاتێك ئەم فورقوشمەی کە پەتە دەرەوە، بۆ نموونە لە نزیك سەوزەفرۆشێك ئەم فورقوشمە ئەنیشێتە سەر سەوزەکەو لە ماوەی چەند چرکەیەك دەچێتە ناو هەموو خانەکانی سەوزەکەوەو تۆش دەیخۆیت، بۆیە دەبینیت ئێستا ڕۆژانە، چوار کەس تووشی شێرپەنجە دەبێت، چوار کەس زۆر زۆرە بۆ ئەم شارە، کە لە پێشتردا ئاماژیان بەوە کردبوو، کە ڕێژەکە ئاساییە، بەڵام ئەم ڕێژەیە ئاسایی نییە، ئێستا چەندان کەس هەن، کە هەر هەستیان پێنەکردووە، یان نازانن، یان نەچووە هەتا ئەو کاتەی دەمرێت. کۆمەڵێ سەرچاوە هەیە بۆ شێرپەنجە، بەڵام ئەمانە بە گشتی یارمەتیدەرن بۆ شێرپەنجە، ئینجا لایەنی هەوا، کە گواستنەوەی گشتی بوونی نەبوو، هەر سەیارەیەك بڕێکی زۆر لە ($CO_2$ – co) دەخاتە هەواوە، بە تایبەتی (co) کار لە هیمۆگلۆبینی خوێن دەکات. لەجیاتی ئەوە شەمەندەفەر، یان پاسی گشتی هەبوایە، جێگەی ئەم هەموو ئۆتۆمبێلەی بگرتایەوە، ئەمە لە لایەك.. لە ناو شارەکانیشدا، هیچ شوێنێکی پیادەمان دابین نەکردووە، بۆئەوەی خەڵك بە ئارامی بتوانێت پیاسە بکات، یان لە ماڵەوە بۆ ناو بازاڕ بڕوات، پێویستە ڕێڕەوێك دروست بکەیت، تاکو خەڵك بتوانێت سودی لێوەربگرێت، یان پاسکیل ڕێگاوبانەکانمان شوێنی پاسکیل سواری نییە، کە ئەمە بێجگە لەوەی ژینگەکەت پاك ڕادەگرێت، تەندروستیی ئەو کەسەش، باش دەکات، کە پاسکیل بەکاردەهێنێت لەجیاتی ئەوەی سەنتەری وەرزشی بکەینەوەو بە خەڵك بڵێین ئەم خواردنانە بخۆنو ئەمانە مەخۆن، نەشتەرگەریی چەوری، ئەمانە چارەسەر نین، دەتوانیت بۆ ماوەی دوو، یان سێ، یان شەش مانگ ئەمە بکەیت، خەڵك بە پێی سروشتی خۆی لێی بێزار دەبێت. لە ڕاستیدا، دەبێت ژینگەیەکی وای بۆ دروست بکەیت، کە خۆی حەز بکات لەشی بەکاربهێنێت، دەبێت ڕۆژانە دوو کاتژمێر لەشی خۆت بەکاربهێنیت بۆئەوەی ئەو وزەیەی کە هەیە، بەکار بخرێت، جا لە ڕێگەی پیادەوە بێت، یان پاسکیل سواری. ئەمە پلانی ژینگەی شارە. شارەکەت دەبێت مرۆڤدۆستو ژینگەدۆست بێت. بەگشتی شارەکانمان، ژینگەدۆستو مرۆڤدۆست نین، بەڵکو ئۆتۆمبێلدۆستن! دەتوانم بڵێم شاری ئۆتۆمبێلدۆست، شارێکە تەنها نەخۆشی دەهێنێت، هەوای پیسی لێ بەرهەمدێت.





بەشی سێیەمو کۆتایی فازیل شەورۆ

# بنەماکانی ئەزموون

١- ئەزموونی ڕەسەن First (Experience):- ئەو ژنەی خۆی ژنی بەسەردا هاتووە، خاوەن ئەزموونی ڕەسەنی هەوێدارییە، بۆ نموونە:-

أ- ئەزموونی دەستی دوو Second (Experience ):- ئەو ژنەی هاوڕێیەکی ژنی بەسەردا هاتووەو ڕۆژانە هەست بە تاڵیو سوێریی هاوڕێکەی دەکات، ئەوا دەبێت بە خاوەنی ئەزموونی دەستی دوو.

ب- ئەزموونی دەستی سێ: (Third Experience) کە بابەتی ئەزموونەکە، وەك حیکایەتو چیرۆك، لە زاری خەڵکی دیکەوە دەبیستین، ئەوە پێی دەگوترێت: (ئەزموونی دەستی سێ). وەك دەڵێن: گیای بارێزە، بۆ چارەسەری بەردی گورچیلە باشە! ڕیکلامو بانگەشەکان لەم جۆرە ئەزموونەن.

جگە لەم خاڵانەی لە سەرەوە، ئاماژەمان پێدا.. دەیان ئەزموون لە مێشکماندا ڕەگی داکوتاوەو بەبێ ئاگایی ئێمە، یان نەویستانە زۆر بەجوانیو ڕێکوپێکی کارەکانی خۆیان ئەنجام دەدەن، وەك چاڵێنانی بەیانیانو ڕیشتاشینو ئارایشتکردنو ئۆتۆمبێل لێخورینو بۆنکردنو تامکردنو تایپکردنی ئەم بابەتەی بەردەستت... هتد.[1]

## چۆن فێری ئەزموون دەبین؟

زۆرجار ئەم پرسیارە دەکرێتو ئەزموونناسانیش بە زەردەخەنەیەکی منداڵانەوە وەریدەگرنو خاوەن پرسیارەکە بە کەسێکی فەقیرحاڵ لە قەڵەم دەدەن، چونکە ئەزموون فێرناکرێت، ئەوان لە میانەی لێکۆڵینەوەکانیان، لە چەمکی ئەزموونو نهێنییەکانی، گەیشتوونەتە ئەو ئەنجامە کە دەکرێت باس لە ئەزموونو بنەماو ئەلەمێنتو توخمەکانی بکرێت، بەڵام هەرگیز ناکرێت باسی چۆنێتیی فێربوونی ئەزموون بکرێت. بۆچی؟ چونکە ئەزموون، بەری داری ئیشکردنو کارکردنە، جا تا بۆ خۆت نەبیت بە قارەمانی چالاکییەکانو نەکەویتو هەڵنەکەیت، ناتوانیت بزانیت شێوەو ڕووخساری ئەزموون چۆنەو ببیت بە خاوەن ئەزموونەکە،[2] کتومت وەکو یاری فوتبۆڵ وایە: گەر تا مردن، دەست لە چەنەگە بەرانبەر سکرینی تەلەفزیۆن دابنیشیت، ناتوانیت ببیت بە یاریزان، بەڵام گەر بۆ خۆت چوویتە نێو گۆڕەپانی یاریو دەستت بە مەشقو یاریکردن کرد، ئەوا هێدی هێدی فێری ئەزموونەکانی یاری فوتبۆڵێن دەبیت. جا گەر کەسێکی دیکە، ویستی هەمان ئەزموونی تۆ فێر ببێتو دووبارەی بکاتەوە، ئەوا دەبێت ئەویش شوێن پێی تۆ هەڵبگرێتو لاسایی تۆ بکاتەوە، وەلێ بە ئەقڵو هزرو جەستەی خۆی.

دەبینین خاڵی درەوشاوەی بابەتەکە لێرەدا (هەڵەکردنە)، وەك (Oscar Wilde) دەڵێ:- ئەزموون شتێکە، کەس ناتوانێت بە خۆڕایی بە دەستی بهێنێت.[3]

واتا قوربانیدانو ڕەنجکێشانی دەوێت. ئەوانەی دەستو

1- http://en.wikipedia.org/wiki/Experience#Types_of_experience

2- http://www.goodreads.com/quotes/tag/experience

3- http://www.biography.com/people/oscar-wilde-9531078

پێ سپینو دەست لە ئەژنۆو کارناکەن، هەمیشە کەم ئەزموونترن لەوانەی لە کایەکانی کارکردندا قاڵبوونەتەوە. بۆیە (Patrick Suskind) دەڵێت: "بەهرە بە تەنیا هیچە. ئەزموون دەرکەوتەی کاری جددییەو هەموو شتێکە!"[4] کەواتە ئەزموون بۆ خۆی (مامۆستایە)، نەك بابەتی وانەی مامۆستا، جوانترینو سەرسورهێنەرترین ئەزموونیش، ئەوەیانە کە تا ئێستا تەشریفی نەهێناوەو پێی ئاشنا نەبووین.

خاڵی سێیەمین کە ئەزموونناسان، لەم تەوەرەدا هەڵوەستەی لەسەر دەکەن، ئەوەیە: کە نابێت ئەزموون بە کات (Time) ببەسترێتەوە، یان زەمەن یەکسان بکرێت بە ئەزموون. لای خۆمان ئەم هەڵەیە زۆر دەکرێت؛ کاتێك مامۆستایەك (بۆ نموونە)دەڵێ من ئەزموونی (٢٥) ساڵم لە وانەوتنەوەدا هەیە، کە ڕاستییەکەی وانییە: ئەو هەر سێ چوار ئەزموونی لەم (٢٥) ساڵەدا پەیدا کردووە، (یەکەمین وانە کە چووەتە پۆل/ دەمەتەقەیەکی چاوەڕوانەکراوی لەگەڵ خوێندکارێکی لاسار، زیزبوونێك لەگەڵ بەڕێوەبەرەکەی کە جارێ غیابی داوە... هتد) ئەوا بەدرێژایی ئەم (٢٥) ساڵە، هەر یەك بابەتی وەکو تووتی دووبارەکردۆتەوەو ڕۆڵی ڕیکۆردەرێکی ئاسایی بینیوە. (Sandy Lynsay) دەڵێت: (ئەو منداڵەی ئازار دەچێژێتو دەکەوێتو هەڵدەستێتەوە، ئەزموونی گەورەترو مەزنتری هەیە لەو پیرەمێردەی دەرگای ماڵەوەی لەسەر خۆی داخستووەو ژیان بەسەرناکاتەوە).[5] بۆیە کوردیش گوتویەتی: ڕێوییەکی گەڕۆك، لە شێرێکی ناو بێشە، زیرەکترە.

### مرۆڤ جەوهەری ئەزموونە:-

(Jules Verne) وای بۆ دەچێت کە: (زانست بەرهەمی هەڵەکانە، هەڵە سوودبەخشەکان، ئەوانەی ورد ورد بەرەو حەقیقەتەکانمان دەبەن).[6] لێرەدا کەسی هەڵەکەر مرۆڤەکەیە، کە هەم جەوهەری هەڵەکەیەو هەم هەڵگری هەڵەکەیە، بە شێوەی ئەزموون. وەك جەوهەر ئەو ناتوانێت لە ئازارو ژانی هاوڕێیەکەی خۆی تێبگات، تا بەهەمان تاقیکردنەوەدا تێنەپەڕێت. (تا لە نێو خۆڵەمێشی خۆی هەڵبستێتەوە، هۆما دەبێت سەرەتا بسووتێت- [7] (Butler .E Octavia) هەر ئەزموونێك پەندو عیبرەتێك لەخۆ دەگرێت، وەلێ هەموو پەندو عیبرەتێك، هەڵگری ئەزموون نییە! هزرو ڕۆحو جەستە، کە سێ توخمی پێکهاتەی مرۆڤن، پارێزەری ئەزموونەکانن، جا هەر ئەزموونەو ڕەهەی تایبەتی خۆی هەیە: بۆ کچە تایپیستێك دەستو پەنجەو چاوەکانی، بۆ شاعیرێك هزرو خەیاڵی، بۆ ئەفسەرێك ئەقڵو جەستە، بۆ سۆفییەکی خەڵوەتنشینیش، ڕۆحو هزرو ناخ!

لە جێی خۆیەتی، لێرەدا پەیوەندی نێوان (ئەزموون)و (ئێستا The Present) شی بکەینەوە:- ئەزموون، دوو زەمەنی هەیە:-

یەکەم:- ساتەوەختی لە دایکبوونی "دوێنێ بێت، یان نێو سەدە بەر لە ئێستا".

دووەم:- ساتەوەختی دووبارەبوونەوەی، کە ئێستایە. ئێمە پێشتر گوتمان، هەر ئەزموونێك قابیلی دووبارەبوونەوەی نەبێت -وەك ڕووداو- ئەوا هێلکەیەکی پیسە. بۆیە گوتراوە گەر دوێنێ لە دیدی تۆدا مەزنترین ڕۆژ بوو بێت، ئەوا مانای وایە، کە ئەمڕۆ تۆ هیچت نەکردووە. ئەمە کرۆکی فەلسەفەی ئەزموونە! [8]

### کام ئەزموونە، مەزنو کاریگەرە؟

دەبێت ئەو حەقیقەتەمان قبوڵ بێت، کە مرۆڤ داهێنەری ئەزموون نییە. ئەوە ڕووداوو کارەکانی مرۆڤە، کە ئەزموون دێنێتە کایەوە، وەك میرات بۆ ئێمەی بەجێ دەهێڵێت، ئەمەش مانای ئەوەیە، کە نابێت مرۆڤ، ببێت بە کۆیلەی قەدەری ئەزموون، بۆچی؟ چونکە دوو جۆرە ئەزموون هەیە:- ئەزموونی ڕەسەنو ئەزموونی ساختە. نەناسینەوەو کارکردن بە ئەزموونی ساختە، هەڵەکانمان کوشندەترو ئاڵۆزتر دەکات. هەر ئەزموونێك ئەم خەسڵەتانەی خوارەوەی نەبێت، ئەوا بۆنی ئەزموونی ساختەی لێدێتو هەوڵبدە لە بیرخۆتی بەریتەوەو کاری پێنەکەیت:[9]

یەکەم:- سودبەخش بێت (Useful):-

هەر وەختێك هانات بو ئەو ئەزموونە برد، لە کاتی پێویستیدا، دەبێت کاردانەوەکەی پۆزەتیفو بەکەڵكو جێگیر بێت.

دووەم:- بەکاربێت (Usable):-

گەر ئەزموونی دەستکەوتوو، لە هیچ کەشو هەوایەکدا، لەگەڵ ژینگەو باری ژیانی ڕۆژانەی تۆدا نەگونجێت، ئەوا ئەزموونی ساختەیەو لەلای خۆت، بیسڕەوە.

سێیەم:- مەرغوب بێت (Desirable):

با وا دابنێین ئەزموونەکە، هەم سوودبەخشەو هەم بۆ بەکارهێنان شیاوە، بەڵام هەست دەکەی لەگەڵ کەلتوورو ڕۆشنبیریو کومەڵگای تۆدا ناگونجێت، کەواتە هی ئەوە نییە، دووبارە بەکاری بهێنیتەوە.

چوارەم:- بەردەست بێت (Findable):

کە نەتوانێت ئەزموونە، کە لە نێو پێ تەرازووی ئەزموونەکان لە کاتی پێویستدا بدۆزیتەوە، بە ئاسانیو بۆخۆت هەڵیبژێریت، ئەوا وەك بوونی نەبێت وایەو پێویست ناکات خۆتی پێوە خەریك بکەیت.

پێنجەم:- جێگای متمانە بێت (Creditable):-

بە لای زۆربەمانەوە ئەمە بایەخدارترین خەسڵەتی ئەزموونی سەرکەوتووە، چوون پێش ئێستا تاقیتکردۆتەوەو هیچ نیگەرانیو ڕاڕاییەك لە پراکتیزەکردنیدا، جێگای مەترسی نییە.

پوختەی بابەتەکەمان ئەوەیە، کە هەرگیز لە هەڵەکردندا نەترسیت، هەمیشە کەشکۆڵێکیشت لە پشت بێ، بۆ کۆکردنەوەو پاراستنی ئەو ئەزموونانە، لە ئانو ساتی خۆیدا.

(Zakis Kazant Nikos) جوانی گوتووە: "هەموو کەسێك هەڵەی هەیە، گەورەترین هەڵە، ئەوەیە کە هەڵەت نەبێت! [10]

4- http://en.wikipedia.org/wiki/Patrick_S%C3%BCskind

5- http://en.wikipedia.org/wiki/Lynsay_Sands

6- http://www.britannica.com/EBchecked/topic/626297/Jules-Verne

7- http://www.goodreads.com/author/show/29535.Octavia_E_Butler

8- https://www.goodreads.com/quotes/tag/life-experience

9- http://en.wikipedia.org/wiki/User_experience_evaluation

10- http://en.wikiquote.org/wiki/Nikos_Kazantzakis

# زاراوەی کارگێڕی

و. وەهاب حەسیب محەمەد

باجی فرۆشراوەکان: هەندێجار بە باجی کڕین ناودەبرێت، چونکە باجێکە، دەخرێتە سەر کڕین‌و فرۆشتنی بەرهەمەکان. باجی فرۆشتن ڕێژەیەکی سەدییە، لە نرخی بەرهەمەکە دیاری دەکرێت، بەشێوەیەکی سروشتی، کاتێك باجەکە لەسەر بەرهەمەکە دادەنرێت لە بازرگانی وردە "تاکفرۆش"وە بگات بە دەستی بەکاربەر، بەڵام هەندێجار، لەقۆناغە جیاوازەکانی گواستنەوەی بەرهەمدا، باجی فرۆشتن لەسەر بەرهەم دادەنرێت، وەك گواستنەوەی بەرهەم لە خاوەن بەرهەمەوە، بۆ بازرگانی کۆفرۆش، یان لەبازرگانی کۆفرۆشەوە بۆ بازرگانی وردە،پاشان لەبازرگانی تاکفرۆشەوە بۆ بەکاربەر.

١٦- فشاری کار(ضغوط العمل): فشاری ئیشکردن، بەوە پێناسە دەکرێت:. هێزێکی دەرەکی، یان هۆکارە خراپەکانی ژینگەیە، بەهۆی نەگونجانی کرێکاران لەگەڵ فشارەکاندا کارییان لێدەکات، چونکە ئەو تواناو لێهاتووییەی هەیانە، لەگەڵ خواستی کارو بارودۆخی کاری نوێیاندا، ناگونجێت.

ئەم نەگونجاندنە، هۆکاری گۆڕانکاری ناوەکی "گۆڕانکاری لە ناخی کرێکارندا"یە، کە لە شێوەی ماندووبوون، یان ناهاوسەنگی لە جەستەو دەروونی کرێکاراندا دەردەکەوێت‌ودەبێت بە هۆی هەڵسوکەوت‌و بیرکردنەوەی نەشیاو، بەڵام بڕێکی گونجاوی فشاری کار، هۆکاری باشبوونی توانای کارکردنی کرێکارانە، زۆری‌و کەمی فشار لە بڕی دیاریکراو، هۆکاری خراپبوونی توانای کارکردنە، چونکە کەمی‌و زۆری فشار لە ئاستی دیاریکراودا، هۆکارێکی هاندەر نییە، لە هاندانی کرێکاران.

هەرچی سەرچاوەکانی فشاری کارە لەسەر کرێکاران، بریتین لە: ناڕوونیی ڕۆڵی کارکردن، بارودۆخی خراپی ئیشکردن، ناڕۆشنی لە دەسەڵات‌و پەیوەندی ڕێکخراوەیدا، ماندووبوونی زیاتر، یان پەیوەندی خراپ لە نێوان هاوکاران لە شوێنی کارکردندا، دەگونجێت ئەم هۆکارانە گشتیان، لە جێگای کارکردندا ببینرێت.

دەکرێت بەم شێوازانە، فشارەکانی کارکردن کەم بکرێنەوە، یان بەشێوەیەکی گشتی، لاببرێن:

١- دیاریکردنی ڕۆڵی کارکردن بە شێویەکی ورد، بەشێوەیەك هۆکاری کەمکردنەوە، یان تێکەڵکردن، یاخود پێکدادانی هەر ڕۆڵێك بێت لە ڕێکخراوەکاندا.

٢- دووبارە نەخشەکێشانەوەی کار، بەشێوەیەك گونجاو بێت لەگەڵ تاکی کارکەردا، کە هەلی گونجاوی بۆ بڕەخسێنێت لە دابینکردنی پێداویستێکانیدا.

٣- ڕێکخستنی ژینگەی کار بەشێوەیەك تاك "کرێکار، کارمەند" بتوانێت بە شێوەیەکی ساناو گونجاو، کارەکانی ڕاپەڕێنێت. هەروەها دابینکردنی کەشی سروشتی وەك: پلەی گەرمای گونجاو، دانانی هەواکێش‌و ڕووناکی لە شوێنی کارکردن‌و ... تاد. گشت ئەو هۆکارانە یارمەتیدەرن لە تەواوکردنی ئیشدا، دوور لە ئاستەنگەکانی کارکردن.

٤- گواستنەوەی کرێکار لە جێگایەکەوە، بۆ شوێنێکی دیکەی کارکردن لە ناو ڕێکخراوەکەدا.

٥- پیادەکردنی چالاکی وەرزشی، بەشداری پێکردنی کرێکاران لەگەشت‌و سەیراندا.

١٧- هێڵەکانی دەسەڵات (خطوط السلطة): ئەو هێڵانەیە کە لەنەخشەی ڕێکخستندا دەردەکەوێت، لە ڕێگای ئەو هێڵانەوە، دەسەڵاتی جێبەجێکاری‌و ڕاوێژکاری دەردەکەوێت، هەروەها پەیوەندییە ڕاستەوخۆو ناڕاستەوخۆکانی نێوان کارو یەکە کارگێڕییەکان، هێڵەکانی دەسەڵات ڕوون دەکاتەوە.

دەسەڵاتی جێبەجێکاری، هێڵەکانی بریتیە لە پەیوەندیی نێوان سەرۆك‌و بەردەست (کرێکار، کارمەند) بەشێوەی (—) دەردەکەوێت (واتە هێڵێکی درێژ) شێوەی ئاسۆیی، یان شاقوڵی لە خۆدەگرێت، لەدەسەڵاتی جێبەجێکاریدا کۆتایی هەموو هێڵێك دەگات بە ناوەندی لاکێشەیەك، یان چەن لاکێشەیەك کە دەسەڵاتی بەردەست‌و یەکەکارگێڕێکان پیشان دەدات، بەم شێوەیە هێڵەکان لەسەرەوە بۆ خوارەوە دادەبەزێت، تا دەگات بە نزمترین نەخشەی ڕێکخستن، یان کاری ڕێکخراوەکە.

بەڵام دەسەڵاتی ڕاوێژکاری، بریتییە لەو هێڵانەی، یان ئەو پەیوەندییە نافەرمییانەی لە ڕێکخراوەکەدا هەن. دەکەوێتە دەرەوەی هێڵە دریاریکراوە یاساییەکانی پەیوەندیکردن، هێڵەکان دەسەڵاتی جێبەجێکاری لە نەخشەی ڕێکخستندا بە شێوەی (..........) دەردەکەوێت.

حسین نجم الدین قەرەداغی
بەشی یەکەم



# مافی منداڵ لە نێوان خواستو واقیعدا

کاتێــك یادی ڕۆژی جیهانی منداڵان دەکرێتەوە، باســوخواس لە مافــی منداڵو چۆنێتیــی مامەڵەکردن لەگەڵ ئەم یادەدا، کەمو زۆر دەبێــت بە هەواڵی میدیــاکانو هەندێ ئاهەنگو بۆنەی تایبەت بەو یــادە ڕێــك دەخرێت، بە ئومێدی شــەنوکەوکردنی ئــەم بابەتەو دۆزینەوەی ڕیشەیی مێژوویی‌و هەندێ زانیاریی دروست بە خوێنەری بەڕێز بگەیەنین. ئەم بەشدارییە موتەوازیعانەیە دەخەینە ڕوو:

**١- ڕۆژی جیهانیی منداڵ لە دۆسیەی نەتەوە یەکگرتوەکاندا:**

پاش جەنگی جیهانیــی دووەم، لە ١٩٥٠/٦/١دا ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان داوای لە وڵاتان کرد، ڕۆژێك دیاری بکرێت وەك ڕۆژی جیهانی منداڵ، بۆ نیشــاندانی هاوسۆزی‌و هێمای پێکەوە کارکردنو تەبایی نێوان منداڵان، ئەو هەوڵانە بەردەوام بوون، تا لە ١٩٥٩/١١/٢٠دا جاڕنامەی جیهانیــی مافەکانی منداڵ ڕاگەیەنــرا، لە ١٩٨٩/١١/٢٠دا واژووکردن لەســەر ئەم جاڕنامەیە، چووە بواری جێبەجێکردنەوە، کــە (١٩٠) وڵات واژۆی لەســەرکرد کــە لە (١٠) بنەمای ســەرەکی‌و (٥٤) مــاددە پێکهاتووە، هەر لەم جاڕنامەیەدا، بە پێی ســتانداردی نەتەوە یەکگرتوەکان، پێناســەی منــداڵ دەکات بەوەی کە: هەموو مرۆڤێکە کە تەمەنی ١٨ ســاڵی تــەواو نەکردبێت. واتە (لە کاتی لە دایکبوونییەوە تا ١٨ ساڵیی تەواو دەکات، بە منداڵ ئەژمار دەکرێت).

ئەو جاڕنامە جیهانییەی، کە باســی مافــی منداڵ دەکاتو داوای نەتەوە یەکگرتوەکانەو چەند ئۆرگانێکی تایبەت بە منداڵ لە ئاستی نەتەوە یەکگرتووەکان وەك (یونیسێف)، نیشانەی گرنگیدانو زانینی بایەخی ڕۆڵی منداڵە، هەندێ مافو پێداویستیشی بۆ منداڵان ئاماژە پێکــردووەو لەو جاڕنامەیەدا جێگیر کراوە، بەڵام ئەو جاڕنامەیەی مافەکانــی منــداڵ هەندێ ناتــەواوی‌و کەلێنی گــەورەی تێدایە، کە باســی قۆناغــی پێش لەدایکبــوون (کۆرپەلە)ی تێــدا نەکراوە، هیچ میکانیزمێــك، نیشــان نەدراوە بــۆ ئەو وڵاتانەی کە لەســەر ئەرزی واقیع مافی منداڵان پێشــێل دەکەن، ڕووبەڕووی سزاو لێپێچینەوەی نێودەوڵەتی ببن، تا ببێت بە هۆکاری بە پراکتیزەکردنی مافی منداڵ.

ڕۆژی جیهانــی منداڵ لــە هەندێ وڵاتدا لە (٦/١) لە هەندێکی دیکەدا (١١/٢٠) لە بەشێکی دیکەدا (١٠/٧) ئەنجام دەدرێت.

**٢- مافی منداڵ لە ڕوانگەی ئایینی ئیسلامەوە:-**

گرنگیی تەواو بەمنداڵ دراوە، مرۆڤەکان بە ڕچاوڕوون دەکات چــۆن مامەڵە لەگەڵ ئــەم بوونەوەرەدا بکەن، هەر لە ســەرەتای قۆناغــی دروســتبوونییەوە، کــە بــە (کۆرپەلە) دەناســرێت کە لە(ڕەحــم) منداڵدانی دایکیدا، لەوەش دوورتر لەو بابەتە حســاب دەکاتو لە هەڵبژاردنی دایکی باشــەوە، دەست پێدەکاتو دەتوانین بەمشێوەیە بیخەینە ڕوو:

ا- هەڵبژاردنــی دایکێکی باش‌و لێهاتــوو و بەئەزموون، کە بە شێوەیەکی دروست، توانای پەروەردەکردنی منداڵی هەبێت.

ب- مافــی ژیــان:- ئەویــش بە دانانــی چەند یاســایەك، بۆ پاراســتنی گیانی کۆرپەلە، لە قەدەغەکردنی کوشتنو لەناوبردنو لەباربردنی، ئەوەتا خوای گەورە دەفەرموێت: (ولا تقتلوا أولادكم) الانعــام/١٥١، هــەر لەو کاتەی ئــەو کۆرپەلە، دەبێــت بە خاوەنی ڕۆح‌و هەمــوو مافێکــی مــادی‌و بردنی میــراتو هتــد....... ی بۆ مســۆگەر دەبێت. لە پێناو پاراســتنی گەشــەی کۆرپەلەدا، ڕێسای تایبەتی بە ئافرەتی دووگیانی داناوەو مۆڵەتی دواخســتنی هەندێ پەرستشەکانی پێداوە وەك (ڕۆژوگرتن).

ج- مژدەو خۆشــی بە هاتنە دنیــای منداڵەوە:- خوای گەورە لە قورئاندا ئەم دیمەنەی تۆماری کردووە: (فبشرناه بغلام حليم) الصافات١٠١ (و بشروه بغلام عليم) الذاريات ٢٨

د- دیاریکــردنو چەســپاندنی وەچە: بۆ پاراســتنی منداڵ لە ونبــوونو پەرتەوازەبوونو ناونــانو دیاریکردنی باوك‌و دایکیەتی. کە ئەمەش مافی شــیرپێدانو دایەنیکردنی لەســەر خەرجکردنو میراتبردن مسۆگەر دەکات، بە پێی ئەو ڕێساو یاسایانەی کە ئاینی ئیســلام دایناوە لەسەر موسوڵمانانی واجب کردووە، ئەوەتا خوای گەورە لەسورەتی الاحزاب -٥(ادعوهم لأبائهم هو أقسط عند الله)

هـ- شــیرپێدان بۆ ماوەی دووساڵ (والوالدات يرضعن أولادهن حولين كاملين لمن أراد ان يتم الرضاعة)البقره ٢٣٣.

و- دایەنیکــردن (الحضانــة) پەروەردەکــردنو پاراســتنو دادپەروەری لە نێوان منالاٌندا.




# چیرۆکی یوتیوبو سێکوچکەی داهێنەرانی

ئا: برهان محمد
مامۆستای زانکۆو ڕاهێنەری گەشەپیدانی مرۆیی

یوتیـوب بریتییـه لـه پێگەیەکی وێبـی ناسـراو، تایبەت بە بەشـداری گرتـه ڤیدیـۆیو ئەفلامەکان، ئـەم پێگەیـە ڕێگە بە بەکارهێنەرانو بەشـداربووانی دەدات بە بینینو دابەزاندنو دانانی -داونلـۆدو ئەپلـۆد-ی گرتە ڤیدۆییەکان بـە خۆڕایی. بە گوێرەی ڕووپێوییەکانی ئەلیکسا لـه ١-٩-٢٠١٣ دا، له جیهاندا یوتیوب لە ڕیزبەندی پێگەمیللیو جەماوەرییەکان لە دوای فیسـبووكو گۆگڵ بە پلەی سێهەم دێتو ڕۆژانە ١٠٠ ملیۆن گرتەی ڤیدۆیی دادەبەزێتو تەنهـا لـه ڕۆژی ٢٤-١١-٢٠١٢ بینەرانی ڤیدیۆکانـی گۆرانی بێژیکی کۆریای باشـوور گە یشـتۆتە یەك ملیـار بینەر، لە ئێسـتادا ئەم پێگەیە لەلایەن زیاتر لـه ٦٥ کارمەندەوە بەڕێوەدەچێت، لە تەنها یەك خوولەکدا زیاتر لە ١٠٠ کاژێر گرتەی ڤیدۆیی ئەپلۆد دەکرێت.

بۆ یەکەم جار یوتیوب لە ١٤ی شـوباتی سـاڵی ٢٠٠٥ لە شاری سـان ماتیو لە ناوچەی سـان ماتیـوی ولایەتـی کالیفۆرنیا –لەو ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لە لایەن سێ گەنجی داهێنەرەوە دامـەزرا، لە ڕۆژی ٢٣ی نیسـانی ٢٠٠٥ یەکەمیـن گرتەی ڤیدیۆیی بەناونیشانی «من لەباخچەی ئـاژەڵاندا- Me at the Zoo»"کە ماوەکەی تەنها ١٨ چرکە بوو، کە لەلایەن یەکێك لەو سێ گەنجەوە دانـراوو ئەپلۆد کـرا. ئەم پێگەیە بەهۆی هاوکاریو پشـتیوانییە داراییەکانی کۆمپانیای "Sequoia Capital" کە تایبەت بوو بە پشتیوانیکردنی پـڕۆژە نـاوازەکان بۆ ماوەی ساڵێك بە بڕی ١١,٥ ملیۆن دۆلار هاوکاریو پشتیوانی لێکرا، بە ئەزموونی دەستی بەکار کردو دوای شـەش مانگ کارکردن بە فەرمـی کارکردنی ڕاگەیاند. تەنها ماوەی سـاڵێك بۆ کۆمپانیای یوتیوب بەس بوو، تا لە سـەر قـاچو پێی خۆی ڕاوەسـتێو درێژە بە کارەکانی بدات. شـایەنی باسـه یەکەمین ئۆفیسـی یوتیوب لە ١٥-٢-٢٠٠٥، لەناو گەراجێکی چاککردنی ئۆتۆمبێلو پاشان لەسەر بینایەی چێشتخانەو پیتزایەك لە شاری سان فرانسیسکۆ کرایەوەو کۆمپانیای یوتیوب وەك .www YuoTube.com تۆمارکراو پاشان گەشەی کرد.

کاتێك باسـی یوتیوبو بەرهەمەکانی ئـەم کۆمپانیایە دەکەین، ناکرێت هەوڵو کۆششو شەونخونییەکانی سێ کوچکەی داهێنەرانو بنیاتنـەرانو دامەزرێنەرانـی ئـەم کۆمپانیایە فەرامـۆشو نادیدە بگرین، بە واتایەکی تر لەگەڵ ناوهێنانی یوتیوب ناوی سـێ گەنجی داهێنـەرو کۆڵنەدەر دێتە بیر، ئەوانیـش بریتین لە هەریەك لە:- ستیڤی شای چێن، چاد هیرلیو جواد کریم. ستیڤی چین، لە مانگی ئابی ساڵی ١٩٧٨ لە شاری "تای بای" پایتەختی تایوان لە دایکبووەو تا تەمەنی هەشت ساڵی لە تایوان ژیاوە، بەهۆی خراپی گوزەرانو باری دارایـی خێزانەکەیانەوە، بەخێزانی لـە تایوانەوە بۆ ئەمەریکا کۆچ دەکەن. لەگەڵ کۆچبەری بوونی-سـتیڤی- توانی خوێندنی ئامادەیی لـە ڤوتابخانەی "جـۆن هیرسـی" "John Hersey" لە -شـاری ارلنغتـون هایفیس -تـەواو بکات، لە هەمان کاتـدا یەکێك بووە لە سەرکردە دیارەکانی "ئەکادیمیای الینوز بۆ زانستو ریاچیات". پاشان سـتیڤی پەیوەندی بە زانکۆی ئلیۆنز- Illionis- لە شـاری ئاربانە چامپەیـن "Urbana -Champoign" دەکاتو لـە خوێندنـی زانسـتی کۆمپیوتەر وەردەگیرێت. لە کاتـی خوێندنی زانکۆییدا بە پـارت تایـم لەگەڵ کۆمپانیای پـەی پـۆل" "Pay pal" کاردەکات. سەرەنجام بە سەرکەوتوویی خوێندنی زانکۆیی تەواو دەکات.

چـاد میـردس هیرلـی- Chad Meredith Hurley- لـە ٢١-تشـرینی یەکەمـی ١٩٧٧ لـە نزیك شـاری بیردسـبورو-

Birdsboro - له ویلایەتی پنسـلڤانیا - Pennssylvania- لەدایکبوەو هەر لە نزیك ئەو شـاره گـەوره بووه، کوڕی ناوەنجی خێزانەکەیانـه لـه نێـوان دۆنالدو جۆن هیرلی خوشـكو برای، چـاد بـووه ئەندامـی -کۆمەڵـەی تەکنەلۆژیـای خوێنـدکاری- قوتابخانەکەیـانو لـه ئەنجامـی تواناو کەشـه فراوانەکانی بواری هونەری، ساڵی ١٩٩٥ توانی سەرکەوتوانه لە خوێندنگەی توین ڤالی " Twin Vally High School" خوێندنـی ئامادەیـی تـەواو بکات. شـایەنی باسـه باوکی چاد ڕاوێژکاری دارایی بوو، دایکیشـی وانـەی پرۆگرامی نەخشەسـازیو دیزاینی بـۆ خوێندکاری زیرەك – Gifted Program-ی وتۆتـەوه. چاد بڕیاری دا لە خوێندنی هونەره جوانەکان لە زانکۆی ئیندیانا "Indiana " لە پنسـلڤانیا بخوێنیت. لەگەڵ بەردەوامی خوێندنی زانکۆیی گوێبیستی کار بوو لـه -کۆمپانیای پـەی پۆل- کە ئەم کۆمپانیایـه گرنگی بە بواری دارایـیو ئابووری دەدات لە تـۆری جاڵجاڵۆکەدا، هەر بۆیە هیرلی بەزووترین کات سـیڤی – C.V.- خۆی پێشکەشـی کۆمپانیا کردو بەمەرج بۆ کارکردن قبوڵ کرا!

کاتێك چاد گەیشتە کالیفۆرنیا بە مەبەستی کارکرن لە کۆمپانیای ناوبـراو، داوای لێکـرا بەرامبـەر وەرگرتنی، لۆگۆیەکـی تایبەت بۆ کۆمپانیا دروسـتبکاتو بنەخشـێنێت، بەم هەنگاوه تواناکانی زیاتر دەرکەوتـنو تـا ئەمڕۆ هەمان لۆگۆی کۆمپانیایـه، چاد بە دیداری سـتیڤی گەیشـتو پردی هاوڕێیەتیان بەسـت، شـایەنی باسە زۆر بەخێرایـی بوونـه دوو هاوڕێی نزیكو زۆربەی کاتـی بەتاڵییان بە وتووێژو ڕاگۆڕینەوه لەسەر بوارو بیرۆکە داراییەکان دەبردە سەر.

سـاڵی ٢٠٠٢، دەرگایەکـی نوێکرایـەوەو واڵابوو لەسـەر چادو ستیڤ، ئەویش لە ئەنجامی کڕینی –کۆمپانیای پەی پۆل- لە لایەن کۆمپانیای ئـی بەی"eBay"بەبڕی ١، ٤٥ ملیار دۆلار، ئەم قۆناغە قۆناغێکـی نوێبوو بۆ بەرەوپێشـچوونو گەشـەی زیاتری هیرلی، بە جۆرێـك بەرامبـەر ڕاپەڕاندنی کارو ئەرکەکانی، دەستخۆشـی دەسـتکەوتو خەڵاتـی داراییو هاندانو پەیوەنـدی زیاتری لەگەڵ بەڕێوبەری کۆمپانیا ڕۆبرت بوسا دەستکەوت فەراهەمهێنا. شایەنی باسـه هیرلی لـه درێژەی سـەرکەوتنەکانی خێزانـی لەگەڵ کانی کلارك پێکهێنـا کە کچـی جێم کلارکی زانای بـواری کۆمپیوتەرو بەڵێندەری بەناوبانگو خاوەنی پڕۆژەی -Silicon Valley. ە.

سـێ کوچکەی سێهەمو کۆتایی یوتیوب جواد کەریمە، جواد لە ٢٨-١١-١٩٧٩ لەشاری میر سبیرج لە ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات لەدایکبووەو پـاش سـاڵێك خێزانەکەیان بـۆ ئەڵمانیای خۆرئاوا کـۆچ دەکەن، باوکی جـواد ناوی "نایمـۆل کریم"ە توێژەرێکی بەنگلادیشـییەو لـه کۆمپانیـای (٣M) کاری کـردووه، دایکی توێـژەرو معید بووه لـه زانکـۆی (مینیسـۆتا) لە بـواری کیمیای زیندەیـی. جەواد لە ئەڵمانیـا گـەوره بووه، لە سـاڵی ١٩٩٢ خێزانی جـواد بڕیاریان دا بچـن بۆ ئەمریکا، جواد لـه ئەمەریکا توانـی خوێندنی ئامادەیی تـەواو بکاتو پاشـان بۆ خوێندنـی زانکۆیی چـووه زانکۆ، بەڵام مەخابن هەر زوو شکسـتی هێنا، ناچار جواد دەسـتی بە کارکردوو لە -کۆمپانیـای پەی پۆل-دا خۆی بینییـەوه، لەگەڵ کارکردن لە ڕێگەی خوێندنی دوورەوه، سـاڵی ٢٠٠٤ توانی خوێندنی زانکۆیی لە بواری زانسـتی کۆمپیوتەر تەواو بکات. جواد لە ڕۆژانی کارکردنی لە کۆمپانیا هەریەك لە سـتیڤیو هیرلی ناسیو هاوڕێیەتی لەگەڵ دروسـتکردن. کریمی توانی لەگەڵ ڕۆژەکانی کارکردن بەرهەمێکی گەورەو بەرچاو پێشکەشـی کۆمپانیای پەی پۆل بکات، ئەویش بە دروسـتکردنو بنیاتنانو دیزاینی سیسـتەمی بەرگری بەرامبەر بە ڕێگری کـردنو بەرپەرچدانەوەی هەموو ئەو پرۆسـەو هەوڵانەی بـۆ دزینو بردنو تەزویرکردنـی دارایی دژ بە کۆمپانیای ناوبراو ئەنجـام دەدرێـت. جواد لە ئێسـتادا ماسـتەری هەیە لە زانسـتی کۆمپیوتـەرو لـه هەوڵی بەدەسـتهێنانی بڕوانامەو پلـەی زیاترە.

لە سـاڵی ٢٠٠٥، سـتیڤو چاد لە شاری فرانسیسـکۆ لە ئاهەنگێکی ئێوارەخوانی هاوڕێیەکیان ئامادەبوون، لەگەڵ بەسـەربردنی چەند چرکەسـاتێکی خـۆشو گرتنـی چەنـد گرتەیەکـی ڤیدیۆیی ناو ئاهەنگەکـە. لە ڕۆژانی دوایی هەردووکیان لەگەڵ جوادی هاوڕێیان باسـی ئاهەنگەکەو سـاتە خۆشو سەرنجڕاکێشـەکانیان دەکرد بە جۆریك جـواد زۆر باوەڕی بە چاد نەدەکرد... ناچار چاد داوای لە سـتیڤی کرد بە هێنانی وێنەکانی ئاهەنگەکە وەك بەڵگەو گەواهی وتەکانیـان. گرتە ڤیدۆییـەکان قەبارەیان گەورەبـوو، بە جۆریك بیرۆکەیەك دروسـتبوو لای هەرسـێکیان کە ئـەم فایلە ڤیدۆییانە گواسـتنەوەیان لـه ڕێـگای نامەو بەریـدی ئەلکترۆنـی کارێکی ئاسـان نییە؟! لە هەمان کات هیـچ پێگەو ڕێگایەك لە ئینتەرنێت نییە بـۆ ئەپلۆدکردنو گواسـتنەوەو بینینیان بە ئاسـانی. دوای بیرکردنەوەیەکـی زۆرو هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی ڕێگایەکی شـیاو، سەرەنجام بیرۆکەیەکیان بۆ دروستبوو، ئەویش بیرۆکەی بنیاتنانی پێگەیەکـی تایبەت بە دانانو ئەپلۆدکردنی گرتەڤیدۆییەکان، وەکو وتویانـه پێداویسـتی دایکی داهێنانە. ئەم بیرۆکەیە سـەرەتای لە دایکبـوونو بنیاتنان دامەزراندنـی ئیمپراتۆریەتی ڤیدۆهاتەکانە، کە ناسـراوه بە یوتیوب-YouTube. هەرسێکیان- چاد، ستیڤیو جواد- بوونە خاوەنی کۆمپانیای یوتیوب. شایەنی باسە لە گۆڤاری تایم مەگەزین وەك داهێنەرانی سـاڵی ٢٠٠٦ لە نێوان- ٥٠ کەسـی داهێنـەر ناوەکانی سـتیڤیو چاد هاتووه، لە سـاڵی ٢٠٠٧ لەلایەن -ئەکادیمیای هونەری ژمارەییو زانست -هیرلیو ستیڤی خەڵاتی ساڵیان پێبەخشراوه.

## فرۆشتنی یوتیوب بە گۆگڵ:-

کۆمپانیای گۆگڵ، لە مانگی ئۆکتۆبەری ٢٠٠٧، ڕایگەیاند لەگەڵ کۆمپانیای یوتیوب گەیشـتوونەتە ڕێکەوتنێـك بە کڕینی لەلایەن گۆگڵەوه بە بڕی ١، ٦٥ ملیار دۆلار، سـەرجەم پشـکەکانی ستیڤو چـادو جواد لە فرۆشـتنی یوتیوب بەرامبەر بـه بڕێك دۆلار لە کۆمپانیای گۆگڵ، بەم جۆرەبوو:- سـتیڤ -٦٢٥، ٣٦٦ پشك بە بری ٣٥٠ ملیۆن دۆلار، چاد -٦٩٤٠٨٧ پشك بە بڕی ٤٧٠،٠١ ملیۆن دۆلار، جـواد -١٣٧، ٤٤٣ پشـك بەرامبـەر ٦٤، ٦ ملیۆن دۆلار. لە ئێسـتادا هەریـەك لە سـتیڤیو جواد لـه کۆمپانیای یوتیـوب خاوەنی ئەم پۆستانەن: ستیڤ بەڕێوەبەری گشتییە بۆ تەکنۆلۆژیاو چاد هیرلی جوادکریم ڕاوێژکاری پێگەی ناوبراوه. شـایەنی باسە هەر یەك لە ستیڤیو جواد، خێزانەکانیان لە سەدەی ڕابردوودا لەبەر برسێتیو هەژاریو کەم دەرامەتی خێزانی، بڕیاری کۆچیان دا!

سەرچاوەکان:

1-The Youngsters Behind YouTube: Steve Chen and Chad Hurley by Evan Carmichael, Select Readings-Linda Lee & Jean Bernard, USA, 2011

2-http://ejabat.google.com/ejabat/thread?tid=44c1a6d61fb060dc

3-http://www.afaqmaroc.com/vb/afaqmaroc105553/

4- سایتیو یکبیدیا-الموسوعه الحره.

# شێوازەکانی تەوقەکردن

**٥- دەرخەری هێزو خۆسەپاندن:-**

ڕەنگە زۆر بە کەمی، هەست بەم شێوازە بکرێت، بەڵام ئاشکرا لە سیاسـەتمەداری کەسە بە دەسەڵاتەکاندا دەبینرێت، بە جۆرێك دەستی خۆی لەسەرو دەستی بەرامبەرەوە دادەنێتو دەستی ئەو دەخاتە ژێر دەستی خۆیەوە، بۆ زیاتر خۆ زاڵکردنو دەرخستنی هێز بەسەر بەرامبەردا خۆی لە لای ڕاستی ئەو کەسە دەگرێت کە تەوقەی لەگەڵدا دەکات، بۆیە زۆرجار دەبینیت زۆربەی سیاسەتمەدارەکان بە پێی توانا هەوڵی دانیشتن لە شوێنی گونجاودا دەدەن.

دەکرێت وەڵامێك نیشانی ئەو کەسە بدەین کە بەو شێوازە مامەڵەت لەگەڵدا دەکات، ئەویش بە گرتنی مەچەکی بێت (کە زۆر گونجاو نییە)، یاخود ئەو جێگایەی لێبگرێت کە وەك خۆزاڵکردن بەکاری دەهێنێت.

**٦- بەخشینی دەسەڵات بە بەرامبەر:-**

ئـەوە کاتێك دەبێت کە کەسی وەستاو لەلای ڕاست لەگەڵ ئـەوەی ئەوپەڕی هێزی هەیەو دەتوانێت خۆی بسەپێنێت، بەڵام بە دەرکەوتنی کەسی بەرامبەری دەستبەرداری پلەکەی دەبێت لە بەرامبەر وەرگرتنی ڕەزامەندی ئەودا.

**٧. تەوقەکردنی لە خۆگرتە:-**

بریتییە لە گرتنی دەستی بەرامبەر بە هەردوو دەستت، لە باری ئاساییداو لە بۆنە کۆمەڵایەتییەکاندا مانای سۆزو بەخشندەیی دەگەیەنێت، بەڵام لە کایە سیاسیەکاندا بە پێچەوانەوە.

**٨. تەوقەکردنی پاڵپێوەنان:-** کاتێك کەسی تەوقەکەر دەستی لە سنوری خۆی زیاتر بۆ بەرامبەر دەباتە پێشەوە، دەرخەری ئەوەیە کە حەز بەوە ناکات کەسی بەرامبەر زۆر لێی نزیك بکەوێتەوە، زیاتر لە کەسە ڕق ئەستورو توندڕەوەکان دەبینرێت، هەروەها لە ناوچە گوندنشینەکاندا زیاترە.

**٩. تەوقەکردنی دڵڕاکێشان:-**

ئەوە کاتێك دەبێت کە دەستی ئەو کەسەی دەتەوێت تەوقەی لەگەڵدا بکەیت، ڕایبکێشیت بەرەو لای خۆت بۆ زیاتر نزیك بوونەوەی لێت، وەك دەربڕینی هەستو سۆزت بەرامبەری تاکو دڵی ڕابکێشیت.

**١٠. دانانی دەستت پلەی میهرو سۆزت دیاری دەکات:-**

جیا لەو دەستەی بەکاری دەهێنیت بۆ تەوقەکردن لەگەڵ کەسی بەرامبەردا، دەکرێت دەستەکەی ترت بەکاربهێنیت بۆ گرتنی مەچەك، یاخود ئانیشك، یان سەرشانی کەسی بەرامبەر بۆ دەربڕینی هەستو خۆشەویستی زیاتر، کە بەرزترین پلەیان دەست خستنە سەر شانیەتی کە زۆربەی کات بە لە ئامێزگرتن کۆتایی دێت، ئەمە زیاتر لەناو ئەو کەسانەدا بەکاردێت کە تێکەڵاویی زۆریان هەیە.

# زانیارییە سەیرەکان دەربارەی جەستەت بزانە!

ئا: تاڤگە شێرزاد یوسف

* هاندەرە دەمارییەکانی بۆ مێشك دەچن، بە خێرایی ٢٧٢ کیلۆمەتر لە کاتژمێرێکدا تێپەڕدەبن.
* مێشك بڕی وزەی گڵۆپێکی (١٠ وات)ی بەکاردێنێ.
* مێشکت لە ٢٠٪ی ئەو ئۆکسجینە بەکاردێنێت، کە دەچێتە ناو سووڕی خوێنت.
* مێشك بە ڕۆژ زۆر زیاتر چالاکە وەك لە شەو.
* مێشك خۆی، هەست بە ئازار ناکات.
* لە٨٠٪ی مێشك، ئاوە!
* ١٧ ماسولکە پێویستە بۆ پێکەنین، بەڵام ٤٣ ماسولکە بۆ توڕەبوون.
* زیاتر لە ٩٠٪ی نەخۆشییەکان دروست دەبن، یاخود ئاڵۆزتر دەبن بە هۆی دوودڵیو قەلەقییەوە(stress).
* ئەگەر لیك نەتوانێت شتەکان بتاوێنێتەوە، ناتوانیت تام بکەی، خواردنو هەر شتێکی تر بۆئەوەی تامی هەبێ، ماددە کیمیاییەکانی دەبێ بتوێتەوە بە هۆی لیکەوە.
* لە ماوەی تەمەنت، لیکت لە دەمت بایی ئەوەندە بەرهەمدێ، کە دوو حەوزی مەلە پڕ بکات.
* ڕووبەری ڕووی سییەکانی مرۆڤ بە قەد گۆڕەپانی باسکەیە، بۆ ئەوەی بە تێروتەسەلی ئۆکسجین بچێتە خوێنەوە، ئۆکسجین دەچێتە هەزاران بۆریچکەو بۆری هەوا، ئەو ڕووبەرە فراوانە هەوا گۆڕکێ ئاسانتر دەکات.
* ناوپۆشی گەدە دەگۆڕێ هەموو ٣ -٤ ڕۆژ جارێك، خانەکانی ناوپۆشەکە هەر زوو شی دەبنەوە بەهۆی بەهێزی ترشی کۆئەندامی هەرسەوە.
* وا مەزندەکراوە کە لەشی مرۆڤ ٦٠٠٠٠ میل دەماری خوێنی هەیە، وا بێنە بەرچاو کە دووری دەوری گۆی زەوی نزیکەی ٢٥٠٠٠میلە، دەمارەکانی خوێنت دەتوانێ زیاتر لە دوو جار بە دەوری گۆی زەویدا خول بخوات!
* گەورەترین کۆئەندامی مرۆڤ بریتیە لە (ڕیخۆڵە باریکە) کە درێژییەکەی بە قەد چوار کەس دەبێو ئەگەر پێچی نەخواردایەتەوە، ئەوا جێگەی نەدەبووەوە لە ناوسکی مرۆڤ.
* نینۆکی ناوەڕاست خێراترین گەشەی هەیە.
* گەشەی نینۆکی دەست نزیکەی چوار جار زیاترە لە گەشەی نینۆکی پێ.
* ددان تەنها بەشە لە لەش کە ناتوانێت خۆی چاك بکاتەوە.




# کرێژی سەر

ن: د.حسان شمسی پاشا
و: یەحیا محەممەد عەلی

٤/٤

- کرێژی سـەر کێشەیەکە زۆر کەس بە دەستییەوە دەناڵێنێت، بە جۆرێك لە(٦٠٪)ی دانیشتوانی ئەمریکاو ئەوروپا دەگرێتەوە.

- زۆربەی کات کرێژێکی کەمە، وەلێ دەبێتە هۆی بێزارکردنی ملیۆنان خەڵك.

- بیروباوەڕێکـی هەڵـە هەیـە دەڵێـت: ئەگـەر شـانەو پێداویسـتییەکانی سـەری کەسـێکی توشـبوو بەکاربهێنین، ئەوا ئێمەش تووشدەبین، بەڵام ئەمە هەڵەیە.

- ڕوودانی کرێژ دەگاتە لوتکە لە بیستەکانی تەمەندا، ڕوودانی لەم تەمەنەدا دەرخەری ئەوەیە کە کاریگەری هۆرمۆنی ئەم بارەی دروست کردووە.

**هۆکارەکانی ڕوودانی کرێژی سەر:-**

١. پێستی وشك:- ئەمە بڵاوترین هۆکاری پەڵەو کرێژی پێستە، لە وەرزی زسـتاندا زیاتر ڕوودەدات، کاتێك هەوای ناوماڵ گەرمەو دەرەوەش سارد.

٢. هەوکردنـی پێسـتی چـەور:- هۆکارێکی گرنگـی ڕوودانی کرێژە، دەناسرێتەوە بە سوربوونەوەیەکی چەور ئاسا لە پێستدا کە وا داپۆشراوە بە چینێکی کرێژی سەرو بەس، بەڵکو ئەو شوێنانەی تریـش دەگرێتەوە کە دەوڵەمەندە بە چەوریـیە ڕژێنەکان، وەك: برۆکان، لاکانی لوت، دەرەوەی گوێ، سنگو ڕان.

٣. بەکارنەهێنانی بڕی پێویسـت لە پاکژکەرەوە:- دەبێتە هۆی کۆبوونەوەی چەوری قژ لە سەردا، ئەمەش کرێژ بە دیاری دەهێنێ.

٤. نەخۆشی سەدەفیە «psoriasis": نەخۆشییەکانی پێستە، تیایدا کۆمەڵێك خانەی مردووی پێسـت کۆدەبێتەوە، کرێژ دروست دەکات، زیاتر لە ئەژنۆکانو ئانیشـك، جاری واش هەیە لە پێسـتی سەردا ڕوودەدات.

٥. ئێکزیما Eczema: ئەگەر ئەم نەخۆشیە هەبێ، ئەوا کرێژ لەسەر پێستی سەرو لەسەر مووەکان دروست دەبێت.

٦. هەسـتیاری "حەساسـیەت" بـۆ بەرهەمـە جوانکارییەکان "contact dermatitis":

دەبێتە هۆی سـووربوونەوەی پەڵە لە پێسـتدا، بەهەمان شێوە زۆر بەکارهێنانی شـامپۆ دەبێتە هۆی وشـکبوونەوەی پێستی سەر دواتریش کرێژ.

٧. هەندێك لە کەڕووەکان وەك "مالاسیزیا": کەڕوویەکە لەسەر پێستی سەر دەژی، بە بێئەوەی هیچ کێشەیەك دروست بکات، بەڵام لە هەندێ کاتدا گەشـەکەی سنور تێدەپەڕێنێت، دەژی لەسەر ئەو چەورییانەی سەلکی موو دەری دەدات، دەبێتە هۆی گەشەکردنێکی خێـرای خانـە پێسـتییەکانو دواتـر مردنی ئەم خانـە زیادانەو کۆبوونەوەیان لە پێسـتی سـەردا، لە کۆتاییدا وەك کرێژی سپی لە مووەکان، یان جلەکان دەردەکەوێت.

- ئـەو هۆکارانەی وا دەکات ئەم کەڕووانە بە خێرایی گەشـە بکات: گۆڕانی هۆرمۆنی زۆر خۆ ماندووکردن، نەخۆشـی، پشـێوی دەماریی، وەك نەخۆشـی پارکنیۆن، دابەزینی سیسـتەمی بەرگری لەشو کەم بەکارهێنانی پاکژکەرەوەو شامپۆ.

لە کۆتاییدا:-

- لە ڕاستیدا ڕێگایەك نییە بۆ ڕێگرتن لە ڕوودانی کرێژ، بەڵام بەکارهێنانی شـامپۆی ئاسـایی بە شێوەی بەردەوامو چەند جارێك یارمەتی زاڵبوون دەدات بەسەر ئەم کێشەیەدا.

- بە هەمان شـێوە شامپۆی دژە کرێژ ڕێگری دەکات بۆ چەند ڕۆژی داهاتـوو، بەڵام وا باشـترە شـامپۆی دژە کرێـژ جۆرەکانی بگۆڕێت ماوە ماوە.

# چۆن دەبیتە خاوەنی پێستێکی تەندروست؟

ئا: بەناز ڕەفعەت

تەندروستی پێست پەیوەستە بە شتگەلێك کە بە کاریدێنیت، لە ژیانی ڕۆژانەتدا، ئەو بەرهەمانەی کە بە کاری دێنیت لە گەرماو لە ئارایشت، جۆری ئەو خواردنەی کە دەیخۆیت، باری دەروونیت... هتد.

بە دروستکردنو پەیڕەوکردنی هەندێ گوڕانکاری ئاسان دەتوانی پەرە بە تەندروستی خۆت بدەیتو ببیتە خاوەنی پێستێکی تەندروستو ڕزگارت بێت لە هەر بارێکی نەخوازراو کە پێست هەیەتی. لەوانە:-

**یەکەم: لە ڕێگای خۆراکی ڕۆژانەت:-**

١- شەکرو شیرینی کەمبکەرەوە لە خۆراکەکانت، هیچ کات مەڵێ هیچ شەکر بەکارناهێنم، بەڵکو هەوڵدە بە گوێرەی پێویست بەکاری بێنیت، دووربە لە زیادخواردنی پاقلاوەو جۆرەکانی تری شیرینی، ڕێژەی زۆری شەکر کاریگەری دەبێت لەسەر ڕێژەی مەگنیسیۆم لە لەشدا، وا دەکات کە قورس بێت بەشێوەیەکی تەندروست بمێنێتەوە، لەبەرئەوە هەوڵدە میوەو سەوزە زۆر بخۆی کە دەوڵەمەندن بە ڤیتامیناتو خۆراکی تەندروست بۆ پێستت.

٢- هەوڵدە ڕێژەیەکی سنوورداری ڕۆنە ئاژەڵییەکان بە کاربێنیت، (لەسەرچاوەی گۆشتی سوورو بەرهەمە شیرییەکان، ئەو جۆرە ڕۆنە ڕەنگە ببێتە هۆی هەوکردنی پێستت لە بری ئەوە ڕۆنە تەندروستەکان بەکاربێنە لە سەرچاوەی میوەو ماسی لە خۆراکەکانت، بۆئەوەی ببیتە خاوەنی پێستێکی شێدارو دووربی لە وشکبوونی پێستت.

٣- هەوڵدە ئەو پرۆتینەی کە دەیخۆی لە سەرچاوەی گۆشتی سپی بێت، وەك گۆشتی باڵندەو ماسی هەروەها ئەوە بەسوودترە بۆ تەندروستی ڕیخۆڵەکانت.

٤- ڕێژەیەکی زۆر ئاو بخۆرەوە ڕۆژانە هەوڵدە هەشت کوپ ئاو بخۆیتەوە، بۆئەوەی ببیتە خاوەنی پێستێکی پاكو شێدار، زۆر خواردنەوەی ئاو یارمەتیدەرە بۆ تەندروستی گورچیلەکانتو دەرکردنی ژەهرەکان لە لەشت دەرەنجام دەبیتە خاوەنی پێستێکی تەندروست.

دووەم:- لە ڕێگای شێوازی ژیانت:-

١- دووربە لە قەلەقیو پەستان، بەمەش یارمەتی پێستت دەدەی تەندروستتر دەربکەوی، چونکە باری دەروونیت بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆو ناڕاستەوخۆ، کاریگەری هەیە لەسەر پێستت.

٢- وەرزش بکە، چونکە وەرزشکردن لە شوێنێکی کراوەدا دەبێتە هۆی زیادکردنی ڕۆیشتنی خوێن لەلەش، زیادکردنی سوڕانەوەی خوێن لە پێست.

٣- ئەگەر جگەرە دەکێشی ئەوا وازهێنانت لە جگەرەکێشان بەشێوەیەکی سەیر کاریگەرە بۆ پێستێکی تەندروست، جگە لە زیانە ناوەکییەکانی جگەرە بەرکەوتنی دووکەڵی جگەرە بەشێوەیەکی بەردەوام بە پێستت دەبێتە هۆی پیردەرکەوتنی پێشوەختەی پێست، کاریگەری هەیە لەسەر قژو تێکشکانی نینۆکەکانت.

٤- پێستو قژو نینۆکەکانت بپارێزە بۆ ئەوەی تەندروست بن، ڕۆژانە کرێمە شێدارەکان بەکاربێنە بۆ ڕێگریکردن لە وشکبوونی پێست، دژەخۆر بەکاربێنە بۆ کاتی چوونە دەرەوە بۆ دووربون لە چرچبوونی پێستت.

# چیرۆکی ئاوێنەکان

شناویا محەممەد ئەحمەد

لە شارۆچکەکەماندا خانمێك هەبوو کە زۆربەی کاتەکانی لەگەڵ باخچە پڕ لە گوڵو گوڵزارەکەیو کتێبخانەی ماڵەکەی بەسەردەبردو لە خانوویەکی لە تەختە دروستکراو کە بە گوڵی هەمەجۆرو هەمەڕەنگ ڕووپۆشکراوە دەژیا، زۆر بە کەمی بەشداری بۆنەو ئاهەنگەکانی دەکرد کە سازدەدراو لە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکاندا زۆر باش نەبوو، خەڵکی بە گۆشەگیرو خۆپەرست ناویان دەبرد کە تەنها بیر لە ژیانی خۆی دەکاتەوەو گرنگی بە کەسانی دەوروبەری نادات، ئەگەر هەر کەسێکیش لە شارۆچکەکە گیانی بە خاك سپاردبا ئەم خانمە گوڵێکی دەڕواند لە باخچەی ناوەندی شارۆچکەکە..

یەکێك لە سەیرترین کارەکانی ئەم خانمە ئەوە بوو دوو ئاوێنەی زۆر گەورەی لە باخچەی ناوەندی شارۆچکەکەدا دانابوو، دانەیەکیان شکابوو، هیچ وێنەیەکی تیا دەرنەدەکەوت، دانەکەی تریش ساغ بوو، هەموو ڕۆژێك دەهاتە باخچەکەو دەیسڕی هەتا ڕوون بێتو هیچ پەڵەیەکی لەسەر نەبێت، دواتریش پەردەیەکی بەسەردا دەدا بۆئەوەی تۆزو خۆڵ لەسەری نەنیشێت، خەڵکی شارۆچکەکە بەم کارە سەریان سوڕمابوو، لە واتاکەی تێنەدەگەیشتن تەنانەت هەندێکیان پێکەنینیان پێی دەهاتو بە (ژنە شێتەکە) ناویان دەبرد.

من ئەرکێکی خوێندنگەم هەبوو کە پێویست بوو چیرۆکێك ئامادە بکەم، وەك چالاکی خوێندنگەکەم بۆ چیرۆكو هۆنراوە، بۆ خوێندکارانو میوانەکانی بخوێنمەوە، بیرم لەوە کردەوە کە ئەم خانمە خاوەنی کۆمەڵە کتێبێکی زۆرەو ڕەنگە بتوانێت یارمەتیم بدات، بۆیە بڕیارمدا بچمە ماڵەکەیو داوای یارمەتی لێبکەم، بەو هیوایە ڕۆیشتم کە داواکەم ڕەتنەکاتەوە، کاتێك چوومە ماڵەکەی وێنەی دڵگیرو دڵڕفێنی باخچەکەی تەنها لە کۆشکی شازادەکانی فیلمە کلاسیکیەکاندا بینیبووم! زۆر سەرسام بووم بە ڕێکخستنی باخچەو هەڵبژاردنی ئەو جۆرە جیاوازانە لە گوڵی ڕەنگاو ڕەنگ، لە زەنگی دەرگاکەی ژوورەوەم داو کەمێك چاوەڕێم کرد، کاتێك دەرگاکەی کردەوە ڕووخساری خانمێکی ژیرو میهرەبان کەوتە بەرچاوم، تاڵە سپییە بەفرینییەکانی سەری پێی دەگوتم کە من خاوەنی ئەزمونێکی زۆرم لە ژیاندا، چاوەکانی بە ئاشکرا بانگهێشتی دەکردم بۆ ژیریو ڕەوشتو میهرەبانی، یەکێکیش لە سیفەتەکانی من ئەوەیە ئەگەر کەسێکم خۆشبوێت هەر لەیەکەم بینینەوە خۆشمدەوێتو پێچەوانەکەشی هەر ڕاستە، بەڵام ئەمجارە خۆشەویستییەکی زۆر تایبەتم هەبوو بۆ ئەم خانمەو لە دڵەوە خۆزگەم دەخواست کە کەسێکی نزیکی من بوایەو ئامۆژگاریم بکات لە ژیانمدا..

ئەو خەندەیەکی کردو وتی: (چی تۆی هێناوە بۆ ئێرە خانمی بچکۆلە؟) منیش پاش وریابوونەوە لەو تێڕامانەی بۆ ئەم خانمە هەمبوو وتم: (سڵاو خانم، من یەکێکم لە دانیشتوانی ئێرەو خوێندکارم، پێویستە بۆ سبەی چیرۆکێك بنووسم بۆ ئەوەی بەشداری چالاکی خوێندنگاکەم بکەم، من ناوبانگی تۆم بیستووە کە خاوەنی کۆمەڵێك کتێبی هەمەچەشنیت، بۆیە ئەگەر بتوانیت هاوکاریم بکەیت لە نووسینی چیرۆکەکەم زۆر سوپاست دەکەم)، لە وەڵامدا وتی: (چۆن بتوانم یارمەتیت بدەم لە کاتێکدا تۆ لەبەردەرگاکەم بووەستیتو نەیەیتە ژوورەوە؟!) من بە تەواوی هەستم بە ناوازەیی ئەم خانمە دەکردو هەستم دەکرد کە کەسایەتییەکی جیاوازو دەگمەنی هەیەو ژیانی لەسەر پلانێکی تۆکمەو زیرەکانە دەڕوات بەڕێوە، هەستم دەکرد کە ماڵەکەی پڕە لە ئاوازی خۆشەویستیو میهرەبانی، زۆر دڵخۆشبووم بە هاتنم بۆ ئەوێو هەستم بە ژیانێکی زیندو دەکرد لەم ماڵەدا، لەو کاتەدا کە ئەو خەریکی ئامادەکردنی شیرینی بوو بۆ من، من سەیری ڕێكو پێکی ڕێکخستنی کەلو پەلەکانیم دەکرد، دوو ماسی بچکۆلەی هەبوو لە حەوزێکی بچوکدا، دیوارەکانیشی بە تابلۆی

خەیاڵی نەخشاندبوو، بەخۆمم دەگوت: (سەیرکە!! ئێرە بە تەواوی جیهانێکی جیاوازە لە دەرەوە! ئەم خانمە لە خەیاڵێکی زۆر جوانی ڕاستیدا دەژی!) پاش ئەوەی کەمێك قسەمان کرد دەربارەی ژیانی خوێندنمو بەسەربردنی کارەکانی ڕۆژانەم پرسیاری لێکردم کە دەمەوێت چ جۆرە چیرۆکێك بنووسم، منیش پێموت: (لە ڕاستیدا منیش هەر بۆ ئەو مەبەستە لێرەم، بۆ ئەوەی تۆ پێم بڵێیت لەسەر چی بنووسمو چۆن دەستپێبکەم، تۆ کۆمەڵێك کتێبی ناوازەت هەیە، ڕەنگە بتوانیت یەکێك لە بیرۆکەکانی کتێبێکتم پێ بڵێیت)، بەڵام ئەو وتی: (باشە ئەگەر تۆ دەتەوێت لەسەر هەمان بابەتی ئەوان بنووسیتو هەمان بیرۆکەی ئەوان بەکاربهێنیت، بۆچی چیرۆکەکەت دەنووسیت؟! ئەوان پێش تۆ ئەو کارەیان ئەنجام داوە! بۆچی هەوڵنادەیت خۆت بیر لە شتێك بکەیتەوەو تێڕوانینی خۆت لەبارەی هەر شتێك بێت بخەیتە ڕوو؟) من هیچ وەڵامێکم نەبوو، کە ئەویش زانی شتێکم نییە بۆ وتن دەستەکانی گرتمو وتی: (ڕات چییە ئەگەر پیاسەیەکی باخچەی ناوەندی شارۆچکەکە بکەین؟).

کە چووینە باخچەکە منی بردە بەردەم ئاوێنەکانو پەردەی سەر ئاوێنە نەشکاوەکەی لابردو پێی وتم: (لە هەر ئاوێنەیەکدا سەیری خۆت بکەو پێم بڵێ چی دەبینیت)، کاتێك لە ئاوێنەی یەکەمدا (ئاوێنە شکاوەکە) سەیری خۆمم کرد هیچ شتێك بە ڕوونیو جوانی دیار نەبوو، چونکە ئاوێنەکە بووبوو بە چەند پارچەیەکی وردوردی زۆر بچوکەوە، تەنها چەند شەپۆلێکی زۆر لەوێنەدانەوەی ناتەواوی پچڕ پچڕ دیاربوو هیچی تر، لە ئاوێنەی دووەمیشدا (ئاوێنە ساغەکە) بە تەواویوێنەی خۆمم بینیو زۆر بە جوانیو ڕونی، پاشان پێمگوت: (خانم، لە ئاوێنە شکاوەکەدا هیچ وێنەیەك بە ڕوونیو جوانی دیار نییە، تەنها چەند پارچەیەکی شێوە جیاواز نەبێت، بەڵام لە ئاوێنەکەی تردا وێنەی خۆمم بە تەواویو ڕوونی بینی)، ئەو.. هاتە نزیك ئاوێنەکانو سەیری منی کردو پێی وتم: ( ئەمانە دوو مرۆڤن.. یەکەمیان تێکشکاوەو دووەمیشیان ساغە، یەکەمیان بەهۆی ئەوەوە وای لێهاتووە کە هیچ کات پارێزگاری لێنەکراوەو واڵابووە بۆ هەموو هێرشو زریانێك، هەر کەس هەر کاتێك بیویستایە دەیتوانی بە بەردێکی بچوك بیشێوێنێتو ناشیرینی بکات، کاتێکیش کە شێوا، توانای نیشاندانی ڕاستییەکانی نامێنێتو بەردەوام وێنەی جۆراوجۆرو پارچە پارچەی نادروستو ناتەواو نیشان دەدات، تەنها شت کە هەیەتی ئەوەیە مرۆڤێکی تەواو دەکات بە هەزار پارچەوە! ئەمە نەك هەر ناتوانێت یارمەتی دەربێت، بەڵکو دەبێتە هۆی سەرلێشێواندنیشیان! بەڵام ئاوێنەی دووەم گوزارشت لە مرۆڤێکی ساغ دەکات کە توانیویەتی خۆی بپارێزێت لە هەر هێرشو تێکشکاندنێكو تەنها ئەو کاتانە دەرکەوتووە کە پێویست بووە دەربکەوێت، ئەمە یەك ڕووی بێ درزو بێ پەڵەی هەیەو ڕاستی هەرچییەك نیشان دەدات کە دەچێتە بەردەمی بێ هیچ شێواندنێكو هیچ لێکدانەوەیەکی هەڵە، ئەگەر هەر خەوشێك، نارێکییەکیش بەدی بکات ڕاستگۆیانە پێت دەڵێتو یارمەتیت دەدات کە چاکی بکەیت.

من هەر بەردەوام بووم لە گوێگرتن، ئەویش بەردەوام بوو لە دەربڕینی بۆچوونەکانیو وتی: (کچەکەم.. هەموو ئەم ژیانە تەنها یەك ڕووی هەیەو ناگۆڕێت بۆ هیچ کەسو بۆ هیچ شتێك، ئەوە دەکەوێتە سەر مرۆڤەکان کە چۆن تەماشای دەکەنو چۆن لێکدانەوەی بۆ دەکەن، ئەوە ئێمەین کە بڕیاردەدەین وەك ئاوێنە شکاوەکە بە هەزاران شێوە ژیان پارچە پارچەو هەمەچەشن بکەینو بە پێی بەرژەوەندییەکانی خۆمان هەڵسوکەوتی لەگەڵدا بکەین، یان وەك ئاوێنەی دووەم تەنها بە یەك شێوەی ڕاستو دروست بیبینین، ئێمە لە تێڕوانینی خۆمانەوە هەڵسەنگاندن بۆ ژیانو مرۆڤو دەوروبەرمان دەکەین، نەك لە ڕاستی خۆیانەوە، هەر ئەوەشە کە جیاوازی نێوان مرۆڤی سەرکەوتوو دۆڕاو دروستدەکاتو کاردەکاتە سەر چۆنییەتی ژیانمان..)!

ئەو درێژەی بە قسەکانی داو وتی: (ئەو لاوانەی کە ناتوانن پارێزگاری لە خۆیان بکەن لە ئەنجامدا دەبنە هەزار پارچەو ناتوانن هیچ ڕێگایەکی ڕوون بۆ خۆیان بدۆزنەوە، دەکەونە ژیانێکەوە کە ڕەشو سپی هیچ جیاوازییەکی نامێنێت، ئەو خێزانەی کە یەك پارچە نییەو هەرکەسە بۆخۆی ڕەنگدانەوەی بیرکردنەوەکانی خۆیەتی بێ گفتوگۆو پرسیارکردن، هەر زۆر زوو بنەماکانی بە خێزان بوونی تێدا نامێنێتو زوو هەڵدەوەشێتەوەو توشی داڕمان دەبێت، یان ئەو وڵاتەی کە هەریەکە بۆخۆی سەرکردەیەکە وەك ئاوێنەیەکی شکاو پارچە پارچە دەبێتو هیچ وێنەیەکی ڕوون نابەخشێت بە گەلەکەیو لە ژیانێکی ئاڵۆزی بێ بنەمادا دەگوزەرێن، ئەمانەو هەزاران نموونەی ترمان هەیە کە ئەوە ڕوون دەکەنەوە ئەگەر نەتوانیت خۆت بپارێزیت لە شکان وردە وردە ژیان بۆ تۆ نامێنێتو کەسێکی لە تۆ ژیرترو هۆشیارتر مافی ژیان لەتۆ وەردەگرێتەوە!).

من هەر بە بێدەنگی مابوومەوە، چونکە سەرسام بووم بە هەموو قسەکانیو لەو کاتەدا بیرم لە جیاوازی ئەو ڕۆژە دەکردەوە کە لەگەڵ ئەو بەسەرم بردبوو بە بەراورد لەگەڵ ڕۆژەکانی تردا! من زۆر زۆر سوپاسی ئەوم کردو پێموت: کە تۆ یەکێکیت لە مەزنترین ئەو مامۆستایانەی کە تا ئێستا بینیومە، دووبارە سوپاسم کرد بۆ ئامۆژگارییەکانی، بەڵام ئەو پێی وتم: (من ئامۆژگاری کەس ناکەم، من تەنها ڕێنمایی دەدەمو ڕێگا باشو خراپەکان نیشانی هەرکەسێك دەدەمو دەرەنجامەکانیشیان ڕوون دەکەمەوە، ئەو کات هەرکەسەو ئازاد دەبێت لە هەڵبژاردنی ڕێگای خۆی).

لە کاتی گەڕانەوەمان بۆ ماڵەوە، پێش ئەوەی لە ڕێگاکانمان لە یەکتر جیاببینەوە لێم پرسی: (مامۆستا دەتوانم پرسیارێکی تر بکەم؟ نهێنی ئەوە لە چیدایە کە هەر کەسێك لێرە دەمرێت تۆ گوڵێك لە باخچەی ناوەندی شارەکەدا دەچێنیت؟!)، ئەویش وەك هەمیشە بە خەندە لەسەرخۆکەی خۆی وەڵامی دامەوە: (چونکە ئاوێنە ساغەکە ئەگەر ببینێت پەڵەیەك لەسەر ڕووخسارت هەیە بە هێمنی پێت دەڵێت: بیسڕەو ڕووخسارت نوێ بکەرەوە! کاتێك ڕۆحێك ژیان بەجێدەهێڵێت ئەمە کۆتایی ژیان نییەو پێویستە ڕۆحێکی زیندووی تر دروست بکەین بۆ ژیان، ژیانی مرۆڤێك کۆتایی دێتو هی گوڵێك دەستپێدەکات)!

من تەواوی ئەو شەوە نەنوستمو چیرۆکی ئەم خانمەم نوسی، بۆ سبەی لە خوێندنگە خوێندمەوەو نهێنی ئاوێنەکانی باخچەکەو مەبەستی خانمەکەم بۆ خوێندکارەکانو میوانەکان ڕوونکردەوە، دوای ئەو بابەتە زۆر لە مامۆستایانو دایکانو باوکانو لاوانی شارۆچکەکەم، دەچوونە ماڵی ئەو خانمە، هەتا ڕێنماییان بکاتو لەوانەکانی سوودمەندبن.



# خۆشبەختی هەڵقوڵاوی ناخە

كوڕو كچەكانم دەبیستن كەسانێكی زۆر لەسەر ئەوە دەدوێن كە خۆشبەختی هەڵقوڵاوی ناخە، هەندێكیش لە ئازیزانم گومانیان لەمە هەیە، دەڵێن: كوا هەموو ئەوانەی كە بانگەشە بازرگانییەكان قسەی لەسەر دەكەن لە خۆشی پارەو پوڵو پلەی بەرزو گەشتو گوزارو ڕابواردن... ئایا ئەمانە شتانێكی ناوەكین؟

یان دەتانەوێت شتێك بدۆزنەوە بۆ دڵنەوایی كردنی موفلیسانو بێبەشان؟

وەڵام: نەخێر..

گرنگ ئەوەیە كە جیاوازی بكەین لە نێوان خۆشبەختیو چێژ وەرگرتن، لە ڕاستیدا چێژ بینین سەرچاوە دەگرێت لە خواردنی شتێك، یان دەست لێدان لە شتێك، یان سەیركردنی شتێكی دیار... و كەمخایەنو كاتییە، چێژ بینین لە خواردنو خواردنەوەو خەوتن لەسەر بالیفێكی باش...، ئەمانە لە كاتێكدا دەبێت كە بەردەوام بینو پەیوەست بین پێوەی، ئەگەریش لێی دابڕێین بچینە سەر شتێكی تر، چێژەكەی تەواو دەبێت، دەبێتە یادگاری، خۆ ئەگەر چێژ بینینەكە لە شتێكی قەدەغەكراو بێت كەسەكە هەست بە تاریكییەكی ڕۆحانی دەكات، لەگەڵیشیدا لۆمەو پەشیمانی؛ چونكە ئیدی درك بەوە دەكات كە سەرپێچی خودای —باڵادەست—ی كردووەو لاوازبووە لە بەرامبەر ئارەزووەكانیدا.

بەڵام كوڕو كچەكانم خۆشبەختی شتێكی كاتی نییە، چوار كۆڵەكەیە لە ئەوپەڕی شادیو پڕئاسوودەییو ڕەزامەندیو دڵنیاییدا، ئەمەش لە زۆربەی كاتەكاندا سەرەنجامی هەستی كەسەكەیە بەوەی كە لەسەر ڕێگەی ڕاستەو لە شوێنێكی ڕاستە، خاوەن هەڵوێستی ڕاستە، پەیوەندیی ڕاستە، بە كورتی بریتییە لەو هەستەی كە دەگەڕێتەوە بۆ باوەڕی ئەو كەسەی ژیان دەكات بەپێی ڕێساو بایەخو بیروباوەڕەكانی، هەر لەبەر ئەم هۆكارەشە باوەڕدارانو چاكەكاران دڵخۆشترینو لە ئەوپەڕی دڵنیاییو ئەماندان، وەك خودای گەورە دەفەرموێت: ( من عمل صالحا من ذكر أو أنثى و هو مؤمن فلنحيينه حياة طيبة ولنجزينهم أجرهم بأحسن ماكانوا يعملون) سورة النحل ٧٩ ، هەروەها دەفەرموێت: (الذين امنوا ولم يلبسوا ايمانهم بظلم أولئك لهم الأمن وهم مهتدون) سورة الأنعام ٢٨

گەر هەندێك وردەكاریتر ئاماژەی پێ بكەین، دەكرێت بڵێین: هەست بە خۆشبەختی دەكەین:

كاتێك زەلیلی دەنوێنین لەبەردەم خودای بەخشندەو میهرەباندا، كاتێك لە موناجاتداین لەگەڵیدا، داوای لێدەكەینو سكاڵای لا دەكەین، كاتێك تەواو خۆمان دەدەینە دەست هێزو دەسەڵاتی خوداو لەهێزو توانای خۆمان بێنیاز دەبین.

كاتێك سەردەكەوین بەسەر هەواو ئارەزووەكانماندا، خۆمان دەگرین لە بەرامبەر شتە سەرنجڕاكێشەكان.

كاتێك یارمەتی كەسێك دەدەین بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی لەگەڵ قورساییەكانی ژیان، لەبەرەوەی خۆشبەختی وەك بۆن وایە، ناتوانی خەڵكی پێ گوڵاوپڕژێن بكەیت، بێئەوەی هیچ پریشكێكت بەربكەوێت.

كاتێك بیرمان دەوڵەمەند دەكەین بە چەندەها بیرۆكەی ناوازە، كاتێك مەزنی دەربڕینە جوانەكان دەدۆزینەوە.

كاتێك كارێكی گەورە بە ئەنجام دەگەیەنین، دڵەكانمان لێوان لێو دەبێت لە ڕەزامەندی بەرامبەر ئەوەی ئەنجامامان داوە.

كاتێك ڕۆحو دەستمان سەرقاڵی كاركردنە لە پێناو بەدیهێنانی شتێك كە دەمانەوێت بەدەستی بهێنین.

كاتێك تێكەڵاوی ئەو جوانییانە دەبین كە خودای گەورە خوڵقاندویاتی لە گەردووندا، شاگەشكە دەبین بە زەردەخەنەی منداڵێكو نامەی هاوڕێیەكی ئازیزو جریوەی بولبولێكو پریشكی ئەو ڕووناكییەی لە پەنجەرەكەوە پەل دەهاوێت بەرەو ڕوومان.

### ئەمانە چی دەگەیەنێت لای كچو كوڕەكانم؟

١. بەدوای خۆشبەختی نەبڕاوەدا بگەڕێن، لە ڕێگەی كارە چاكەكانو ئامادەبوون لەو شوێنەی دەبێت بوونمان هەبێت.

٢. بێكاریو بەتاڵیو تەمەڵیو پاشاگەردانی سەرچاوەیەكن لە سەرچاوەكانی دڵتەنگی، بۆیەش دەستبەرداریان بن، گەر دەتانەوێت دڵخۆشبن.

٣. خۆتان ڕابهێنن كە خۆشییەكەتان بە كۆمەڵ بێت بە بەشكردنی ئاسوودەیی لەگەڵ خزمو كەسو هاوڕێ... دڵنیابن كە دڵخۆشكردنی خەڵكی یەكێكە لە مەزنترین دەروازەكان بۆ نزیكبوونەوە لە خودا.

٤. مرۆڤ دەتوانێت شادمان بێت بەو كەمەی لەبەر دەستیدایە، بیكاتە سەرچاوەیەك بۆ ئاسوودەییەكی نەبڕاوە، گەر مایەی ڕازیبوون بوو.

ن: د. عبدالكريم بكار     و: ئاسيا صەلاح

Asman Group

بڕیار

# "بێوێنەترین منداڵ"

## خولەکانی ترمان بۆ دایکان بوو ئەمجارە بۆ منداڵەکان خۆیانە !

## لەم خولەدا :

- چۆن منداڵەکەت ببێتە خاوەنی بەرزترین ڕەوشت ؟
- (لەماڵەوە ، لە قوتابخانە ، لە ڕێگا و بان ، ....) چۆن منداڵەکەت جوانترین هەڵسوکەوت ئەنجامبدات؟
- چۆن لەگەڵ ( باوک و دایک ، مامۆستا ، ....) ناوازەترین مامەڵە بکات و گوێڕایەڵیان بێت ؟
- چۆن منداڵەکەت لەگەڵ ( هاوڕێ ، هاوپۆل ، خوشک و براکان ، .... ) لە شەڕ و دەمەقاڵێ بەدوور بێت ؟
- چۆن منداڵەکەت لە ( دڵڕەقی ، توڕەیی ، حەسوودی ، نا لێبوردەیی ، دەست نوقاوی ، چەندین ڕەوشتی ناشرینی تر ) بەدوور بێت ؟
- چۆن منداڵەکەت پاک و خاوێن و تەندروست و کەشخە بێت ؟
- چۆن کەسایەتی خۆی بونیاد بنێت ، متمانەی بەخۆی هەبێت و کەسایەتیەکی بەهێزی هەبێت ؟
- دەتەوێت منداڵەکەت ببێتە خاوەنی بەناوبانگترین جۆری زیرەکی ؟
- چەندین بابەتی تر کە منداڵەکەت دەکاتە خاوەنی ناوازەترین و سەرکەوتووترین کەسایەتی لەناو کۆمەڵگادا !

## دایک و باوکی ئازیز

- دڵنیاین کەمتەرخەم نەبوویت لەبەخێوکردنی منداڵەکەت ، بەڵام ئایا پەروەردەت کردووە !؟
- منداڵەکەت بەشداری زۆوۆر خولی ( زمان ، کۆمپیوتەر ، ...)ی کردووە ، بەڵام ئەی ڕەوشت و کەسایەتی
- ئەگەر دەتەوێت بێ خەم بیت و لە هەرزەکاری و لاویدا کێشەت بۆ دروست نەکات ،
تا هەویرێکی شلە با پەروەردەی بکەین !



بۆ پەیوەندیکردن :

07714690100

GrupyAsman



- پەلە بکە لە ناونووسین 10-8-2014 خولەکەمان دەستپێدەکات
- بەشداربوو دەبێت لەو خوێندکارانە بێت کەساڵی داهاتوو دەچێتە پۆلەکانی ( 2 ، 3 ، 4 ، 5 )
- ماوەی خولەکە ( 20 ) ڕۆژ دەبێت ، هەموو ڕۆژێک جگە لە ڕۆژانی ( هەینی ، سێشەممە )
- ڕۆژانە ( 9:00 ) بۆ ( 12:00 ) ی بەیانی
- ( هاتووچۆ ، خواردن ، هەموو پێداویستیەکانی خولەکە ) دابینکراوە
- گەشت و چوونە دەرەوە بۆ خوێندکاران ئەنجام دەدرێت
- لەکۆتایی خولەکەدا و لە ئاهەنگێکدا بڕوانامە بەبەشداربوان دەبەخشرێت
- نرخی بەشداریکردن ( 150،000 ) دینارە

**ناونیشان : تەلاری جەمالی حاجی عەلی - شەقامی سالم -پێش بەڕێوەبەرایەتی پەروەردەی سلێمانی**

# بوێریی باڵوڵی حەکیم



حەکیم سەرەڕای ئەوەی زاناو دانا بوو، وەڵامەکانی دروستو بەپێز بوون، ژیرو لێهاتوو بوو، خوداپەرستو دونیا نەویست بوو، لە هەمان کاتدا کەسێکی چاو نەترسو ئازا بوو، هەرگیز لە خەلیفەو دەسەڵاتداران نەترساوەو هەرچی حەقو ڕاستی بووە بێ سڵەمینەوە بەرامبەر دەسەڵاتدارانو کاربەدەستان ڕاشکاوانە وتویەتیو لە سزاو ئازاریان سڵی نەکردۆتەوە، هەڵوێستی ئاوازەی وەهای هەبووە کە بە سەدان کەس نەیانتوانیوە وەها هەڵوێستێك بەرامبەر دەسەڵاتداران بنوێنن..

لە چیرۆکی ئەمجارەدا باس لە هەڵوێستێکی ئاوازەو دەگمەنی حەکیم دەکەین کە بەرامبەر خەلیفە هاروون نواندوویەتی، ڕووداوەکە بەمشێوەیە بوو:- ڕۆژێکیان خەلیفە هاروون کیسەیەك دراوی دا بە باڵوڵی حەکیم، پێی گوت بڕۆ دابەشی بکە بەسەر کەسانی هەژارو نەداردا، حەکیمیش پارەکەی وەرگرتو ڕۆیشت بۆ نێو بازاڕو کوچەو کۆڵانەکانی شاری بەغداد، بە دوای کەسێکدا دەگەڕا کە هەژارو نەدار بێتو پێویستی بە یارمەتی هەبێت، تا بڕێك لەو پارەیەی پێ بدات کە خەلیفە پێی داوە، بەڵام دوای گەڕانو ماندووبوونێکی زۆر پارەی بە هیچ کەس نەدا.. کیسە پارەکەی وەکو خۆی بردەوە بۆ خەلیفەو لە بەردەمی خەلیفەدا دایناو پێی گوت: زۆر گەڕام، ئەوەندە گەڕام کە ماندووبووم، پێیەکانم بڕستییان لێبڕا.. بەڵام هیچ کەسم نەبینی لە خەلیفە هەژارترو نەدارتر، لەبەرئەوە پارەکەم هێنایەوە تا بیبەخشم بەو کەسەی کە لە هەمووان زیاتر ئاتاجە، بەو کەسەی کە لە هەمووان زیاتر هەژارە، ئەویش جەنابی خەلیفەیە!

خەلیفە دەیزانی حەکیم مەبەستێکی هەیەو ئەو کارەی بێ حیکمەت نییە، لەبەرئەوە پرسیاری ئەو ڕەفتارەی باڵوڵی حەکیمی کردو داوای لێکرد تا هۆکاری ئەو کارەی ڕوون بکاتەوە؟

حەکیم لە وەڵامدا وتی: من لە بازاڕداو لەبەردەم هەر دووکانێکدا سەربازو دارودەستەکەی تۆم بینی وەستابوون، بە زۆر باجو سەرانەیان لە خەڵکی وەردەگرتو دەیانهێنا بۆ گەنجینەو خەزێنەی جەنابی خەلیفە، لەبەرئەوە واهەستدەکەم کە تۆ لە هەموومان زیاتر پێویستت بە پارەو سامانە، چونکە تۆ ئەگەر ئاتاج نەبی بۆچی بەزۆر سەرانە لە خەڵکی وەردەگری؟! هەرلەبەرئەوە پارەکەم گێڕایەوە بۆخەزێنەی تۆ!

مرۆڤی ئازاو بەخشندە ئەو کەسەیە کە لە ڕەنجو ماندووبوونی خۆی دەبەخشێت، لەو ماڵو سامانە دەبەخشێت کە بە هۆی کارو کاسبی حەڵاڵی خۆیەوە پەیدای کردووەو مافی هیچ کەسێکی بەسەرەوە نییە، سامانێك کە دوور لە فێڵو دەستبڕین، دوور لە ساختەکاریو بێ ویژدانی پەیدای کردووە، هەر لەو ماڵە دەبەخشێت، ئازایەتیو بەخشندەیی لەو ماڵەدا نییە کە بە فرتو فێڵو دەستبڕین پەیدابووە، یاخود ئەو ماڵەی کە لە کەسانێکی زەوت بکەیتو بیبەبخشیت بە کەسانێکی دیکە! بەڵکو ئازایەتی بەخشینی ئەو ماڵەیە کە پاکو حەڵاڵەو دوور لە فێڵو ساختەکاریی پەیدا بووە!



# ئایا متمانەت بە خۆت هەیە، یان نا؟

تکایە وەڵامی ئەم پرسیارانە بەمشێوەیە بدرەوە:-
(بەڵێ- زۆرجار، بە دەگمەن، نەخێر)..

١- ئایا لە کاتی ڕۆیشتندا سەرت بەرزت دەکەیتەوەو هەنگاوی پتەو دەنێیت؟

٢- ئایا لە کاتی قسەکردندا بە ڕوونیو دەنگێکی ڕەوان قسە دەکەیت؟

٣- ئایا دڵنیایی لەوەی کە دەتوانیت بەهرەو تواناکانت زیاد بکەیت لە یەکێك لە بوارەکاندا؟

٤- حەزدەکەیت خۆت لێکدانەوە لەسەر ڕووداوەکان بکەیت، یان دەتەوێت کەسانی دیکە لێکدانەوە لە سەر ڕووداوەکان بکەن؟

٥- ئایا دەتوانیت جیهان والێبکەیت، کە شوێنێکی شایستە تر بێت بۆ ژیانت؟

٦- ئایا دەتوانیت پارێزگاری لە ڕووخۆشیو هاوسەنگیت بکەیت، لە کاتێکدا هەموو ئەو شتانەی کە خاوەنیت لە دەستی دەدەیت؟

٧- ئایا لە تواناتدا هەیە سەرنجو پێشنیار پێشکەش بکەیت، بۆ چاککردنو بەرەو پێشبردنی کارەکانت؟

٨- ئایا دەتوانیت پارێزگاری لە سیماو ڕووخسارت بکەیت؟

٩- ئایا دەتوانیت چارەسەری ئەو کێشەو گرفتانە بکەیت کە لە کارەکەتدا ڕوودەدات؟

١٠- ئایا لەو باوەڕەدایت کە بتوانیت تواناو بەهرەکانت زیاتر لەوەی ئێستا کە هەیە کۆبکەیتەوە؟

١١- ئایا دەتوانیت کارێك ئەنجام بدەیت بۆ لابردنو نەهێشتنی ترسو هۆکارەکانی نیگەرانیو دڵەڕاوکێت؟

١٢- ئایا دەتوانیت لەسەر بەرنامەیەك بڕۆیت کە ئامانج لێی بەرەو پێشبردنو باشکردنی داهاتووت بێت؟

١٣- ئایا دەتوانیت بە درێژایی ڕۆژگار پارێزگاری لە هێمنیو ئارامیت بکەیت؟

١٤- ئایا دەتوانیت لە ڕێگەکەت بەردەوام بیت، بێئەوەی تەسلیمی شکستو ئەو تەنگو چەڵەمانە ببیت کە دووچارت دەبن؟

تێبینی:- بۆ هەر وەڵامێکی بەڵێ..(٢٠)خاڵ، زۆرجار..(١٥) خاڵ، هەندێجار.. (١٠)خاڵ، بە دەگمەن.. (٥) خاڵ، نەخێر.. (سفر).

ئێستا ڕادەی متمانە بوونت بە خۆت بزانە:-

* ئەگەر زیاتر لە (٢٥٠) خاڵت بەدەستهێنا، ئەوا تۆ کەسێکی بەهێزیو خاوەنی متمانە بەخۆبوونی.

* ئەگەر (٢٠٠-٢٥٠) خاڵت بەدەستهێنا، تۆوی بێ متمانەیی لە ناختدا بوونی هەیە، بەڵام خاوەنی هێزی بەرەنگاربوونەوەی.

* کەمتر لە (٢٠٠) خاڵ، دەپرسین بۆچی متمانەت بەخۆت نییە؟پێویستە چاوبخشێنیتەوە بە هۆکارەکەیدا، تۆ پێویستت بە بەرهەمهێنانی وزەو توانایەك هەیە کە گەشبینیو هیواو ئاوات لە ناختدا بڕوێنێت، تا بتوانیت متمانەبەخۆبوون لە ناختدا زیاد بکەیت.. بۆ ئەم مەبەستە ڕەچاوی ئەم خاڵانە بکە:-

أ- قسەی خەڵکی هۆکاری سەرەکییە بۆ خاوکردنەوەو دابەزاندنی ورەو تواناکانت، لەبری ئەوەی گوێ بۆ قسەی کەسێك بگریت کە دەڵێت تۆ ناتوانی ئەو کارە بکەیت، گوێ بۆ قسەی کەسێك بگرە کە دەڵێت بۆچی هەوڵ نادەیت؟

کەواتە بە دەستی خۆت تابلۆی ژیانت ڕەنگ بکە، ڕێگە مەدە کەسێکی دیکە تابلۆی ژیانت ڕەنگ بکات، چونکە ئەو تەنها ڕەنگی ڕەشی لا دەستدەکەوێت.

ب- هەوڵ بدە هەموو شکستێك لە ژیانتدا بکەیتە هۆکارێك بۆ سەرکەوتن.

ج- جێگرتنەوە، هەوڵ بدە لاوازیو کەمو کورییەکانت بگۆڕیت بۆ هێزو توانای ناوەکیت.

د- خۆت پەسەند بکە، لە خۆت ڕازیبە وەکو ئەوەی کە خودای گەورە دروستی کردویت، ئەمە مانای ئەوە نییە، کە تەسلیمی توانا سنوردارەکانی خۆت بیت، بەڵکو لە تواناو بەهرەکانت سوودمەندبەو بە تەواوی هۆکارەکانی لاوازیو بێ متمانەییت فەرامۆش بکە.

ە- سەرکەوتنەکانت بژمێرە، هەمیشە بۆ نیوە پڕەکەی پەرداخ بڕوانە.

ز- لەسەرو هەموو ئەمانەوە باوەڕبوون بە خودای گەورەیە.

# نەخشەیەك بۆ گۆڕینی باوەڕە نەرێنییەکان بە ئەرێنی

چیا عەبدوڵا

دڵنیابە لەوەی کە بە تەنها بیت لە شوێنێکی بێدەنگو ئارامداو بۆماوەی (٣٠) خولەك کەس سەرقاڵت نەکات، گرەنتی سەرکەوتنی ئەم پلانەش لەوەدایە کە هەنگاوەکانی یەك لە دوای یەك جێبەجێ بکەیت، بە تەواوی کۆك بێت، تێکەڵاو بێت لەگەڵ هەستو شعورتدا لە هەموو هەنگاوەکاندا.

کاغەزو قەڵەمێك بهێنە، ئەمە بنەمای گۆڕینی باوەڕە:-

بنەماکانی گۆڕینی باوەڕ:-

١- باوەڕی نەرێنی:-

* باوەڕێکی نەرێنیت بنووسە کە تواناکانت سنوردار دەکاتو بۆتە ڕێگر لەبەردەم بەگەڕخستنی توانا ڕاستەقینەکانت..

* (٥) هۆکار بنووسە لەسەر گرنگی گۆڕینی ئەم باوەڕە نەرێنیە. چاوەکانت دابخە وابهێنەرە پێش چاوت کە ساتێك بەرەوپێش چوویتو ئەو باوەڕە نەرێنییەت ماوە، چاودێری ئەو ئازارە بکە کە بەهۆی ئەو باوەڕەوە هەستی پێدەکەیت، ببینە کەچۆن ژیانی تاکە کەسیت بەرەو گۆڕان دەبات، ببینە کە لەڕووی کارو تەندروستیو خێزانییەوە چۆن ڕوو لە کەمبوونەوەو دابەزین دەکات، بەردەوام بە لە ڕۆیشتن لەسەرخەتی چوارچێوەی کاتدا، بیهێنەرە پێش چاوت کە (٥) ساڵ بەرەو پێش چوویتو ئەو باوەڕە نەرێنیەت هەر لەگەڵدایە، چاودێری ئەو ئازارە بکەو هەستی پێبکە، ببینە کە ئەو باوەڕە پشتگیریت دەکات، بزانەوات لێ دەکات هەست بەچی بکەیت؟ هەموو هەستو شعورت ببەستەرەوە بەو ئازارەوە، بەردەوامبە لە ڕۆیشتن لەسەر خەتی چوارچێوەی کاتدا بۆ (١٠) ساڵی ئایندە، هێشتا تۆ ئەو باوەڕە نەرێنیەت پێیە، هەست بەو ئازارە بکە، ببینە کە ئەو باوەڕە پشتگیریت دەکاتو تووشی ئازارێکی زۆرت دەکات، ئێستا بگەڕێرەوە، ئێستا چاوەکانت بکەرەوەو سێ هەناسە بە قوڵی هەڵمژەو بیدەرەوە (............).

٢- باوەڕی ئەرێنی:-

* باوەڕێکی ئەرێنی بنوسە کە خۆت حەزت پێیەتی..

* (٥) سوودی ئەو باوەڕە نوێیە بنووسە..

هەست بەو خۆشیە بکە کە لە ڕێگای ئەم باوەڕە نوێیەوە تاموچێژی دەکەیت، چاوەکانت دابخە وابهێنەرە پێش چاوت کە ساڵێك بەرەو پێشەوە چوویت، بەم باوەڕە نوێیەوە، هەست بەخۆشیەکەی بکە، ئەو سودمەندیانە ببینە کە دەستت دەکەوێت بە هۆی ئەو باوەڕە نوێیەوە لە ژیانی کەسێتیو کارو خێزانتو تەندروستیت، بەردەوامبە لە ڕۆیشتن لەسەر هێڵی ئەو کاتە تا (٥) ساڵی ئایندەی تر، هەست بەو خۆشییە بکەو سودی ئەو باوەڕە نوێیە ببینە، بەردەوامبە لە ڕۆیشتن بۆ دوورتر تا (١٠) ساڵی ئایندەت، هەست بەو خۆشییە گەورەیە بکەو ببینەو هەست بکە چۆن بەجەستەتدا هاتووچۆ دەکات، ببینە کە ژیان چۆن باشو بەرەو پێشەوە دەچێت بەهۆی ئەم باوەڕە بەهێزو نوێیەوە، بگەڕێرەوە ئێستا، چاوەکانت بکەرەوە (٣) جار بە قوڵی هەناسە هەڵمژەو بیدەرەوە (.............).

٣- کرداری خودی گۆڕینە:-

* بەلایەنی کەمەوە (سێ) سەرچاوە بنووسە کەیارمەتیدەرت بێت بۆ گۆڕانکاریو دەستگرتن بەباوەڕە نوێکەتەوە..

توانا مادییەکانت چییە؟ توانا مەعنەوییەکانت چییە؟ کێ دەناسی کە هاوکاریت بکات؟

* بەلایەنی کەمەوە (٥) کێشە بنووسە کە ڕەنگە ڕووبەڕووت بێتەوە لەو کاتەی کە تۆ خەریکی ئەو گۆڕانکاریەیت.

بەلایەنی کەمەوە (٣) چارەسەر بۆ هەر یەکێك لەو (٥) کێشەیە بدۆزەرەوەو چاوەکانت دابخە، خۆت ببینە لە ئایندەدا بەو باوەڕە نوێیەتەوە چاودێری ڕەفتارو هەستو شعورت بکە، چاوەکانت بکەرەوەو بە قوڵی هەناسە بدەو (.........)و بڵێ:- من دەتوانم بگۆڕێم، (٥) جار ئەمە بڵێرەوە، (من دەتوانم بگۆڕێم).

(٥) جاریش ئەمە بڵێرەوە: (من متمانەم بە خۆمەو توانای سەرکەوتنم هەیە).. لەم چرکە ساتەوە دەست پێبکە، تواناکانت گەشە پێبدەو بینابکە، متمانەت بەخۆت هەبێت..

متمانەت هەبێت کە تۆ دەتوانیت باوەڕێکی نەرێنی بگۆڕیتو باوەڕی ئەرێنی بخەیتە شوێنیو ئەوەندەی تر توناو هێزت زیاد بکات.. متمانەت هەبێت کە تۆ دەتوانیت هەموو لاوازییەکت بگۆڕیت بۆ هێز..

متمانەت هەبێت کە تۆ دەتوانیت ببیتو خاوەندارببیتو ئەو شتە بەدەستبهێنیت کە خۆت حەزت پێیەتی..

(د. ڕۆبرت شولر) لە پەرتوکی (هێزی ئیجابیدا) دەڵێت:-

(دەتوانیت تەنها ئەو کارە ئەنجام بدەیت کە باوەڕت وایە دەتوانی ئەنجامی بدەیت، دەتوانیت تەنها ئەوەبیت کە باوەڕت وایە دەتوانی ببیت، دەتوانیت تەنها ئەوە بەدەستبهێنی کە باوەڕت وایە دەتوانی بەدەستیبهێنی، هەموو ئەمانە وەستاوە لەسەرئەوەی کەباوەڕت پێیەتی).

بەردەوام لەبیرت بێت تۆ یەك ژیانو یەك تەمەنت هەیە لە ژیاندا بەوپەڕی نایابییەوە بژی..

بەردەوام لە یادت بێت:-

هەموو چرکەساتێکی تەمەنت وەهابژیو وابزانە کۆتا ساتی تەمەنتە، بە باوەڕەوە بژی، بەئاواتەوە بژی، بەخۆشەویستییەوە بژی، بەهەوڵدانەوە بژیو نرخی ژیان بزانە.

# ئایا تۆش سەرسامیت؟

دیاری ئاکۆ

ئایا تۆش وەکو کەسایەتییە سەرکەوتووەکان سەرسامیت بە توانا ناوازەو دیاردە سەیرەکان؟ دەکرێت بپرسیت بۆ کەسایەتییە چاکو سەرکەوتووەکان لە ژیاندا سەرسام بوون؟

بەڵێ، مرۆڤەکان لە پێناو ئەوەی کارێك بە باشی بەرێوەبەرن، یاخود بەسەرکەوتوویی ئەنجامی بدەن، پێویستیان بەوەیە کە سەرسامبن بە دەرئەنجامی ئامانجەکانیان، یان بەو کەسایەتییە چاکو کاریگەرانەی مێژوو کە ناویان بە ناوی تەلاً نوسراوەتەوە. ئەو مرۆڤانەی کە سەرسامن بە سەرسامبوونێکی حەق بە کەسایەتییە باشەکان، هەوڵی جێ پێ هەڵگرتنی هەنگاوەکانی ئەوان دەدەن، ئەو مرۆڤە ژیرانە کە سەرسامی کەسایەتییە سەرکەوتووەکانن سەرئەنجام، یان دەگەنەوە پێیان، یان لەوان پێشتر دەکەون، یان ئەگەر هیچ کام لەمانەش دەستەبەرنەبوو، کارێك دەکەن کە پەشیمان نەبن لێی. پێشەوا عومەر(ڕەزای خوای لێبێت) ڕۆژێك بڕیار دەدات کە نیوەی ماڵەکەی ببەخشێت لە پێناوی پەروەردگاردا، بەمشێوەیە بە خۆی وت کەوا ئەمڕۆ لە چاکەدا پێش پێشەوا ئەبوبەکر دەکەوم، کاتێك چوو تا نیوەی ماڵەکەی ببەخشێت، لە پێش ئەودا پێشەوا ئەبوبەکر هەموو ماڵەکەی بەخشیبوو، پێشەوا عومەر فەرمووی: ئیتر بڕیارمدا لە هیچ شتێکدا پێشبڕکێی پێشەوا ئەبوبەکر نەکەم. با ڕامێنین: هیچ کام لە هاوەڵەکان هێندەی پێشەوا ئەبوبەکر دڵسۆز نەبوو بۆ پەیامبەر (ﷺ)، ئەویش لە گشت هاوەڵانی زیاتری خۆشدەویست نازناوی "صدیق"ی لێنا. بەڵام پێشەوا عومەر بەهۆی سەرسامی بەم هاوەڵەوە بەڕێزەوە جورئەتی بەخۆیدا نیوەی ماڵەکەی ببەخشێت. لە کاتێکدا بەخشین یەکێکە لە نازدارترین و پڕ خێرترین کردارەکان لای خودا، هەموو ئەمانە لەلایەكو فورسی بەخشینی ماڵێك کە با ئارەقەی ناوچاوان پەیدا دەبێت لەلایەك.

سەرسامبوون بەکەسایەتییە لێوەشاوەکان، دەرئەنجامی کاری چاکە، سەرەتای هەوڵدانە بەجۆشو خرۆشو بەردەوامەکانە بۆ کەسانێك کە ئامانجی گەورەیان بەدەستهێنانی بەهرەی زانستە. لە بێرناند ڕاسلی بیرکاری زانو سیاسەتمەداریان پرسی: "ئەو خوێندکارەی کە بەدڵی تۆیە، چۆنە کەسایەتی"؟ وتی: "کەسێکە کە هەمیشە سەرسامبێت».

هەڵدانی کەشتی ئاسمانی بۆ ئەو دیوی زەوی، فڕۆکە، دۆزینەوەی ئامێرێك بۆ بینینی ئافرێنراوە وردەکان...هتد. ڕۆژگارێك جێی باسو خواس نەبوون، چونکە لای هەندێك مەحاڵ بوو، بەهۆیەوە زۆر باسێکی بچووك بوو، خۆ ئەگەر باسیش بکرایە دوور نییە باسکەر ببوایەتە جێی پێکەنینی خەڵکی، بەڵام کاتێك لای کەسە گەورەکان ئەو کەسانەی کە ئەو باسو داهێنانانە بە ڕووخسار بچووکو ناوەڕۆك گەورانەیان بەهەند وەرگرتو سەرسامی "دەرئەنجامەکانیان بوون"، سەرئەنجام بینیمان کە بوونە ڕاستیو چ خزمەتێکیان بە ئادەمی بەخشیو چۆن سەرسامی بە دەرئەنجامی ئامانجەکان جیهانی ئادەمیزادیان بەرەو باشتر گۆڕی. هەروەك ئەندرە ژەید دەڵێت: "ژیر کەسێکە بەهەر شتێکی بچووك سەرسامبێت».

سەرئەنجام: مرۆڤ کاتێك سەرسام دەبێت سەرەتای هەوڵێکی ناوازە بەرەو ئامانجێك دەست پێدەکات کە بەهاتنە دی ئەو ئامانجەی ژیانی خۆیو چەندانی تر دەگۆڕێت. مرۆڤ کاتێك بە کەسایەتییەك سەرسام دەبێت کۆشش دەکات تا لەو باشتر بێت خۆ ئەگەرنا لانی کەم وەك ئەوی لێبێت، ئەمەش زۆر لە پێش ساتە بێ سەرسامبوونەکانی باشترە. بۆ مەگەر هەر سەرسامی نییە بە دەسەڵاتی خوای پەروەردگار مرۆڤ دەگاتە پلەی بەرزی بەندایەتی بۆ خواو لەوێشەوە هەنگاوی یەکەم بەرەو ئاوەدانکردنەوە دەبڕێت؛ چونکە بەندایەتی ڕاستی بۆ زاتی حەق ئاوەدانی زەوی بەدوای خۆیدا دێنێت. جا سەرسامبوونی ژیرانە بەبێ شوێنپێ هەڵگرتنی کوێرانە هەڵسانەوەی ئوممەتێك بە دوای خۆیدا دێنێت، مێژووی ٢٣ ساڵەی هاوەڵان بەرامبەر بە پەیامبەر (ﷺ)و پەیامەکەی باشترین بەڵگەیە. هەربۆیە سەرسام بن بە دەرئەنجامی خەونەکانتان، سەرسامبن بەو کەسایەتیانەی کە مێژوویان گۆڕی، خۆ ئەگەر بە ئەوانیش نەگەن، شتێکی کەمتر لەوان بەدەستناهێنن.





یوسف صابر

# گوێزەکان بکە بە قوربانی خۆت، خۆت مەکە بە قوربانی گوێزەکان!!

دەگێڕنەوە دوو هاوڕێ هەریەکەیان بە فەردەیەك گوێزەوە، شەویان بە سەر دادێو ڕێیان دەکەوێتە ناو بەفرەوە، کاتێك سەرما تینیان بۆ دەهێنێت یەکێکیان وردەوردە گوێزەکانی دەسوتێنێو خۆی پێ گەرم دەکاتەوەو لە سەرما خۆی دەپارێزێت، بەڵام ئەویتریان سور دەبێت لە سەر ئەوەی گوێزەکانی بپارێزێتو بیان باتەوە لەگەڵ خۆیدا، تا لە سەرمادا ڕەق دەبێتەوەو گیان لەدەست دەدات.

ئەگەر ئەمڕۆ تەماشا بکەین دەبینین زۆرن ئەوانەی دەبنە قوربانی گوێزەکانیانو لە پێناو پاراستنی گوێزەکانیان گیانیان لەدەست دەدەن، زۆرن ئەوانەی لە پێناو ماڵدا دەبنە قوربانیو خەڵکی تریش دەکەنە قوربانی، زۆرن ئەوانەی لە هەڵپەی کۆکردنەوەی ماڵدان، بەڵام ئامانجێکیان نییەو نازانن بۆچی کۆی دەکەنەوە؟ بۆچی هەوڵدەدەن؟ تا بەوە دەگات ئەوەی کۆی دەکەنەوە گیانیان لە پێناودا بەخت دەکەن، زۆرن ئەوانەی لە پێناو ماڵدا تەندروستییان لەدەست دەدەن، دواتر ئەوەی بەدەستیان هێناوە بۆ گێڕانەوەی تەندروستیان خەرجی دەکەن، زۆرن ئەوانەی پارە وەك ئامانج تەماشادەکەن، لە پێناو کۆکردنەوەیدا ژیانیان بەخت دەکەن.

کەسێك ئەگەر سەلامەتی خۆی لە دەست بدات، لە سەر کۆکردنەوەی پارە، ئەو پارەیەش هیچ ڕەنگدانەوەیەکی لە سەر ژیانی نەبێتو لە پێناو بەختەوەریی خۆیو ماڵو منداڵی سەرفی نەکات؟ چ بەهایەك بۆ پارە دەمێنێتەوە. پارە تا ئەو کاتە گرنگە ئاتاجی دەستی کەسێکی تر نەبیت، یان ئاتاجی دەستی نامەردت نەکاتو لە دەرگای خەڵکیدا دەست پان نەکەیتەوە، ئەگەر تەماشای ڕۆژگاری ئەمڕۆمان بکەین، دەبینین پارە چی بەخەڵکی دەکات، خەڵکانێکی زۆر بە پارەی میللەتەوە بازرگانی دەکەنو ماڵو سامانیان بەهەدەردەدەنو دەرزیو دەرمانی ئیکسپایەر دەرخواردی میللەتەکەی خۆیان دەدەن.

ئەوە لە کاتێکدایە ئەگەر پارە بوو بە ئامانج، کوێرکردنی ئەوانی ترو هەژاریو نەداریان خەمی تۆ نییە، گرنگ ئەوەیە قاسەو کاسەت تەژیو پڕ بێت، گیرفانو ورگی خەڵکیش با قۆڕەی بێتو خاڵی بێت. پارە گرنگە بۆ ژیان، بەڵام نەگاتە ئاستی پەرستنو لە پێناویدا پاشقوڵ لە خەڵکانی تر بدەی، سەروەری مرۆڤایەتی فەرمووی (تعیس عبدالدینار وعبد الدرهم) با نەبینە بەندەی دینارو درهەم، با پارە وەسیلە بێت لە ژیان. چونکە بەختەوەری لە خودی پارەدا نییە، بەختەوەری لە بەختەوەرکردنی ئەوانی تردایە بە پارەی گیرفانمان.

تۆ وەرە سەیری ناوی پارەکان بکە (دینار= دی + نار) کۆتاییەکەی (نارە) ئاگر (درهەم= در + هەم) کۆتاییەکەی (هەم)ە، خەمو پەژارەیە (دۆلار= دۆ + لار ) کۆتاییەکەی ( لار ) ە، خواریو خێچیو لەڕێلادانە، بزرکردنی ڕاستەشەقامە. ئەوە گوتمان ئەگەر کۆکردنەوەی ئامانج بێت لە ژیاندا.

ئەگەر گوێزەکان وەك دینارو درهەم تەماشا بکەین، ئەوا دەبینین بۆ یەکێکیان بوو بە نارو هەمو خەمو تیاچوون، بەڵام ئەویتریان لە دونیادا گوێزەکانی کرد بە ئاگر (نار) بۆئەوەی هەمو خەمی دونیای پێ بسوتێنێتو لاریو لەوێری ڕێگای پێ ڕاست بکاتەوە.

# بێ سەرفرازی، سەرکەوتن نابێت!

و: چیمەن لەتیف

سەرکەوتن ئاواتی هەموو کەسێکە، هەموو خوازیاری سەرکەوتنین، کەسانێك لەسەرەتاوە ڕێگای سەرکەوتن دەگرنەبەرو دەرگای سەرفرازی دەکوتن. بە ڕقو کەم بایەخەوە تەماشای کەسێك دەکەین کە خۆزگەی نەبێت. لە نێو ئەو ئاواتو خۆزگە گەورانەدا شتێکی شاراوەهەیە:- کە دەیەوێت لە ڕێگای هەوڵدان بۆ دنیاو سەرکەوتن لە دنیادا سەرفرازی دوارۆژمان بیرباتەوە، یان لەبیری کەین، بەشێوەیەك تەوژمی سەرکەوتن، سەرفرازیو ڕێز... تاد. وامان لێبکات بیرمان بچێتەوە کە ئێمە لەپێناو ئامانجێکی گەورەتردا خولقاوین.

ئاینی ئیسلام ڕاستییەکمان دەخاتە پێش چاو، کە دنیا ڕاگوزەرێکە بۆ دوارۆژ، هاوبەش پەیداکردن «خۆشەویستی دنیا» تەلیسمێکی جوانە، بەرەو ئاگر کەمەندکێشمان دەکات.

دنیا جوانو سەرنجڕاکێشە، زێدە قەشەنگە، زۆرباش وەبەرچاو دەکەوێت، بەتایبەت بۆ ئەوانەی هیچی تر نابینن‌و لەگەڵ ئاواتو مەبەستەکانی دوارۆژدا ناژین.

ژیانو دنیا دەتوانێت خەڵکێکی زۆر گومڕابکات، بیانکات بە کۆیلە، ئەو کەسانە لەبەرانبەردا باشترین ساتەکانی تەمەنیان، گوڕو تینیان، خۆزگەکانیان، دەبەخشن بەدنیا، بەرانبەر چێژە کاتیو ئەفسوونە بەسەرچووەکانی. پەیامبەر هەمیشە توندبوو لەگەڵ هاوەڵانیدا لەبەرانبەر چێژی دنیاو جوانییەکانی دنیادا، سوێندی دەخوارد کە لە هەژاریتان ناترسم هێندەی لە دەوڵەمەندیتان ترسم هەیە، چونکە بەهۆی خۆشگوزەرانییەوە نەتەوەو هۆزەکانی ڕابردوو تیاچوون، ترسم هەیە ئێوەش بەهەمان دەردی ئەوان گرفتاربن‌و لەناوبچن.

لەم ڕوانگەیەوە پێشەوا (دروودی خودای لێبێت)، نەیدەویست هاوەڵانی بەشێوەیەك لە دنیا تێبگەن کە بە یەکجاری تەرکە دونیابن، وەك هەندێك لە سۆفییە تەرکەدنیاکان دەیکەن، داوای لە هاوەڵانی نەدەکرد دابنیشین‌و گۆڕەپانی ژیان چۆڵ بکەن بۆشەیتانەکان تا تاوانو خراپە بکەن، دووبەرەکی لە نێوان بەندەکانی خودا دروست بکەن، بەڵکو داوای لێدەکردن هەوڵبدەن، کۆشش بکەن، دەست بەهۆکارەکانی سەربەرزی دنیاوە بگرن، تا لە ژیاندا سەرکەوتووبن، دوارۆژیش سەرفرازبن، بەشێوەیەك هەوڵدانیان تەنها ڕووکەش نەبێتو ناوەڕۆکیان بیرچێتەوە.

بڕوادار پێویستە ژیانی خۆشبوێت تا لەدنیادا بەخشندە بێت، دەبێت زۆر پێداگر بێت لە مامەڵەکردنی لەگەڵ ژیاندا، دنیا ئاوەدان بکاتەوەو کۆششی تێدا بکات بەشێوەیەك جوانتری بکات بەر لەوەی هەبووە، بەڵام نەك لەسەر حسابی دوارۆژ، پێویستە سەرکەوتنی لە دنیادا هۆکارێك بێت بۆ سەرفرازی دوارۆژی، ئاوەدانکردنەوەی دنیا لە ڕێگای سیستەمی ئاکارو بوژاندنەوەی بەردەوامی ویژدانو مامەڵەکردنە بەئاگادارییەوە لەگەڵ دەروونو دنیادا.

بەلاتەوە سەیر نەبێت، ئەگەر بڵێین لە ڕۆژگاری پەیامبەردا گۆڤارێك وەك گۆڤاری(فۆربس) دەربچووایە کە تایبەتە بەکاروکارگێڕی، ئەوا لە لوتکەی هەرە دەوڵەمەندەکانی دنیادا ژمارەیەکی بەرچاوی موسوڵمانی تێدا دەبوو، چونکە باوەڕدار دابڕاو نییە لەدنیاو بەکەم بایەخەوە لێی ناڕوانێت، بەڵکو باوەڕداری ڕاستەقینە ئەو کەسەیە دنیا لەناو دەستیدایە لە دڵیدا هەڵیناگرێتو زیاد لەمافی خۆی بایەخی پێنادات.

یەکێك لە هاوەڵەکانی پەیامبەر (عبدالرحمن کوڕی عەوف) هەشتەمین کەس بوو باوەڕی هێنا» نازناوی باوەڕداری پێدرا» ئەوکات تەمەنی (٢٨) ساڵ بوو، کۆچیکرد بۆ وڵاتی حەبەشە، دواتر بۆ شاری مەدینە، کاتێك گەیشتە مەدینە، بەکراسو کورتەکی بەریەوە گەیشتە ناوشار، پاش ئەوەی بەهاوەڵانی شادبووەوە یەکەمین وتەی بریتی بوو لە: بازاڕم نیشان بدەن؟

(تەلحەی کوڕی عەوف) دەگێڕێتەوە دواتر عبدالرحمن خەڵکی مەدینەی دەژیان، بەشێوەیەك سێیەکی شاری مەدینە قەرزیان لێدەکرد، یەك لەسەر سێیەکەی تریان عبدالرحمن قەرزەکەی بۆ دەدانەوە، بەشەکەی تریشیان قەرزی هەژارانی دەبژاردەوە بۆ دەستڕۆیشتووەکان.

دواتر بوو بە یەکێك لەو دەکەسەی لە ژیاندا مژدەی بەهەشتیان پێدرا. یەکێك بوو لە خاوەنداراکانی ڕۆژگاری خۆی، لەگەڵ ئەو تواناو دەسەڵاتەدا کەهەیبوو دوارۆژی بیرنەکرد، جارێك عبدالرحمن دەچێت بۆلای خێزانی پەیامبەر دایکی سەلەمەو بەپەرۆشەوە پرسیاری لێدەکات: واگومان دەبەم تێدا بچم.

«دۆزەخ جێگام بێت» تۆ دەزانیت من لەناو ئێلی قورەیشدا خاوەندارام، موڵکێکم فرۆشت بەچل هەزار دینار، لە وەڵامدا دایکی سەلەمە وتی: کوڕی خۆم ببەخشە، لە پەیامبەرم بیستووە «کەسانێك لەهاوەڵانم هەن دوای جیابوونەوەم لێیان نایانمبینەوە».

هاوڕێ ئەگەر ژیاننامەی هاوەڵانو گەورەپیاوان هەڵدەیتەوە دەبینیت زۆرێکیان خاوەنداراو بەشکۆ بوون وەك: ئەبوبەکری سەدیق، عوسمانی کوڕی عەفان... کەسانیتریش. دەبینیت چۆنو بەچ شێوەیەك پێداگربوون لە جێبەجێکردنی ڕاستیو گرتنەبەری ڕێگای سەرفرازیدا، چەند جوان دنیایان ملکەچ کردووە بۆ دوارۆژیان، چۆن زاڵبوون بەسەر ئارەزوو دەرونیاندا، دنیان وەك کەنیزەیەك خستۆتە ژێر ڕکێفی خۆیانەوە.

هاوڕێ تۆ کە تەماحت لە دنیادا هەیە دەبێت ئاگاداری دنیابیت، کە ژیان دەگوزەرێنیتو خۆزگەی سەرکەوتن دەخوازیت، کاردەکەیت بۆ چەسپاندنی خۆت لە کۆمەڵگادا، هەوڵ بدە لەم ژیانەدا ژمارەیەکی قورس نەبیت.. بەڵام بیرت بێت دنیا لای پەروەردگار کێشی باڵی مێشولەیەکی نییە، باشترین شێواز بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ دنیادا پەیبردنە بە ڕاستیی دنیا» تێگەیشتە لە دنیا بە درووستی» بزانە دنیا وێستگەیەکە بۆ دوارۆژ.



# پێشەوا غەزالی (٤٥٠-٥٠٥)ك

بەرزان ئەبوبەکر

هەموو شتێك، سەرەتا بچووکە، پاشان گەورە دەبێت، بەڵام بەڵاو موسیبەت، سەرەتا گەورەیەو پاشان بچووك دەبێتەوە.

زانای پایە بەرز ئەبوحامدی غەزالی ناوی (محمدی کوڕی محمدی کوڕی محمد)ە، لە ساڵی (٤٥٠) کۆچی بەرامبەر ساڵی (١٠٨٥) زایینی لە طوس لەدایکبووە، هەر لە تەمەنی منداڵیدا باوکی کۆچی دوایی دەکات، کەسێکی خێرخواز، بۆ ماوەیەك پەروەردەکردنی گرتۆتە ئەستۆ، دواتر ناردوویەتیە قوتابخانەیەکی خێرخوازی، تا لەوێ فێری خوێندن ببێتو ژیانیش بگوزەرێنێت..

دوای چەند ساڵێك چووە بۆ نەیسابورو لەسەر دەستی فەرامیدی فێری تەسەوف بووە، فیقهو زانستی کەلامیش لای پێشەوای حەرەمەین فێربووە، غەزالی لە ئەنجامی لێهاتوویی و زیرەکی و بیرتیژیی خۆی، بووەتە زانایەکی ناوداری سەردەمی خۆی.. چەندین کەس لەسەر دەستی غەزالی فێری خوێندنو زانستو زانیاری بووە..

غەزالی لە تەمەنی (٣٤) ساڵیدا چووەتە بەغدادو لە قوتابخانەی نیزامیە لە سەردەمی عەباسییەکاندا بووەتە مامۆستا، لەو ماوەیەدا ناوبانگێکی زۆری پەیدا کردووەو لە زۆرێك لە شارەکانەوە خەڵکی هاتوون بۆ خوێندن بۆ لای پێشەوا غەزالی، تەنانەت زۆرجار نزیکەی ٤٠٠ کەس لە زاناو خەڵکانی پایەدار لە کۆڕەکانیدا ئامادەبوونو گوێیان بۆ قسەکانی گرتووەو تەکانیان نووسیوەتەوە، لەو ماوەیەدا دوو کتێبی بە ناوەکانی (مقاصد الفلاسفە، وتهافت الفلاسفە) داناوە، دواتر بەغدادی بەجێهێشتووە، ماوەی (١٠)ساڵ دونیانەویستی کردووە، پاشان گەڕاوەتەوە بۆ نەیسابور، ساڵی (٥٠٠) کۆچی دوای چەندین ساڵ وانە وتنەوەو خزمەتکردن بڕیار دەدات ئەو ماوەی دیکەی تەمەنی بۆ خوداپەرستیو پەروەردەکردنی دەروونی خۆی تەرخان بکات.. ئیدی وازی لە وانەوتنەوە هێناوەو دوور لە خەڵکی گوزەرانی کردووە.. تا ئەو ساتەی کۆچی دوایی کردووە.

غەزالی بە گشتی بە یەکێك لە گەورە بیرمەندە موسوڵمانەکانو بە تایبەتی بە یەکێك لە بیرمەندە گەورەکانی بواری زانستی ڕەوشت دادەنرێت، چونکە ڕێگا زانستییەکانی پەروەردەکردنی نەوەو چاکسازیی ڕەوشتە نامۆکانو ڕزگاربوونی مرۆڤ لێیان ڕوون کردۆتەوە، بەوەش لە یەك کاتدا بووەتە بیرمەندو پەروەردەکارو چاکسازی کۆمەڵایەتی.

غەزالی پێی وایە ڕەوشت پەیوەستە بە دەروونی مرۆڤەوە، نەك جەستەی مرۆڤ، ڕەوشت لای غەزالی شێوەیەکی نەگۆڕی هەیە لە دەروونداو هانی مرۆڤ دەدات بە ئاسانیو بەبێ پێویست بوون بە بیرکردنەوەیەکی دوورودرێژ، کارە ڕەوشتییەکان ئەنجام بدات..

سەبارەت بە ژیربێژیو فەلسەفەی پوخت، غەزالی لە لوتکەدا بووە، بەڵام ژیربێژی بۆ سەرخستنی دین بەکارهێناوە، فەلسەفەش لای غەزالی سەر لەو کەسانە دەشێوێنێت، کە خاوەنی ژیریو زانستێکی کەموکورتن.

لە گرنگترین کتێبەکانی پێشەوا غەزالی(مقاصد الفلاسفة ٤٨٧ کۆچی)، (تهافت الفلاسفة ٤٨٨ کۆچی)، المستظهری، الإقتصاد فی الإعتقاد ٤٨٨ کۆچی)، إحیاء علوم الدین (٤٨٨ کۆچی)، کە سەبارەت بەم کتێبە وتراوە (من لم یقرأ إحیاء لیس من الأحیاء) واتە: هەرکەس إحیاء علوم الدین نەخوێنێتەوە لە زیندوان نییە!

(أیها الولد ٥٠١ کۆچی)، المنقذ من الضلال (٥٠٢ کۆچی)، المستصفی فی علم أصول الفقه ٥٠٣ کۆچی)، (الجام العوام عن علم الکلام ٥٠٤ -٥٠٥ کۆچی) ئەمانە لە بەناوبانگترین دانراوەکانی پێشەوا غەزالین، جگە لەمانەش چەندین دانراوی دیکەی وەکو (الوسیط فی المذهب، الوجیز فی فقه الإمام الشافعی، فضائح الباطنیة، القسطاس المستقیم، التبر المسبوك فی نصائح الملوك، کیمیاء السعادة).

غەزالی لە بوارەکانی فەلسەفەو فیقهی شافیعیو زانستی کەلامو تەسەوفو مەنتیق ڕۆڵێکی کاراو دیاری هەبووە، پێشەوا غەزالی لە ساڵی (٥٠٥ کۆچی) لە طوس کۆچی دوایی کردووەو بۆ دواجار ماڵاوایی لە ژیان کردووە.

غەزالی ئەو منداڵەی بە بێباوکی گەورەبوو، بەڵام بووە بەو زانا پایەبەرزەی کە ناوی بۆ هەمیشە زیندوو بمێنێتەوە.



# چۆن دەڕوانیت؟

شەهێن ئیبراهیم ئیسماعیل

ئەو هەموو تاکەی لەدەورتەو هەریەکەیان خاوەن تایبەتمەندییەکن، هەریەکەیان خاوەنی خێزانێکو دەستی پەروەردەیەکن، هەریەکەو خاوەنی ڕوخسارێك، ئاخۆ دەبێت ڕوخسارەکان، ڕەنگدانەوەی ناخەکان بن، هەمان پەروەردەی دەستی خێزان بن. دەبێت ئەم ناسینەوەیە بۆ هەمووان گرانو سەخت بێت، چ باشەکانمان نازانێ خراپ کێیە! چ خراپەکانمان ناتوانن باشەکان ببینن. زنجیرەی ژیان وا ڕێکی خستووین هەرتاکێکمان لەماڵی خۆمان لە شوێنو نیشتەجێی خۆمانو لای خەڵکی خۆمان باشیمان هەبێت، ئەستەمە بۆ هەریەکەمان، سەختەو ناڕەحەتە ئازیزێك وەلابنێین، یان کەسێك بخەینە شوێنی هەمان نازو خۆشەویستی پێ بدەین. ئەم زنجیرەیە ئەوەمان پێ ئاشنا دەکات چۆن هەر تاکێك لە تاکێکی تر بە شێوازی دووان نییە، بە شێوازی ڕوخسار، بە شێوازی نەتەوە، بە شێوازی خاك جودان، ئەوهاش بەشێوازی ناخیان جودان. ڕێگە بە هیچمان نادات تاکێك بین، هەرچی هەمان بێت، هەرچی بکەین خراپ بێت، یان تاکێك هەبێت هەرچی بکات هەموولایەنو تایبەتمەندیی بێوێنەو جوان بێت. بەڵام زۆر بە ڕوونی نیشانمانی داوە جیاواز بین، هەر یەکێکمان لە لایەنێك جوان بینو چەند کەسانێك جوانیو باشیمان ببینن.

ئەوەشمان پێ ئاشنا دەکات کە تاکێکمان دەتوانێت زۆرترین پلەی باشی هە بێت. ڕاستە ڕوخسارەکان ناگۆڕدرێن وەك ئەوەیان لێ بکرێت بە بینینمان لەلایەن دەوروبەرەوە هەموویان گەشاوەو بە ڕوخسارمان ڕازیبن، بەڵام دەتوانین وابکەین کە خۆمان لە خۆمان ڕازی بینو کە بچینە کۆمەڵێکەوە بە گفتوگۆی شیرینو گوفتاری ڕاستو ڕازانەوەی سەرنجی هەمووان کۆبکەینەوە.

هەلی لەدەستدانیشی نەدەینە دەستی هیچ کەسێك.هەروەها پێدانی سامانی دنیاو هەندێ مەوادە کاتییەکانی ژیان بێ ئاگاداری ئێمە دێنو دەچن، دابەش دەکرێت بەسەرماندا، بەڵام بەڕێوەبەری دەستی ئێمەین، ئەگەر هەر کام لە ئێمە وا بڕوانین لە دەوروبەرو ئازیزو هاوڕێمان، ناسراوانی ڕوخسارەکانیانین، ئەوا هەتا بمێنین کەسی ناناسین، وەك کوێرێکی ناخەکانو بینەری ڕوخسارەکان دەبین. بەس ماندوێتی ژیان بەدەست دێنین نەدەگەی بەناسینی خۆت، نە ئەو دەوروبەرەی هەر یەکە لە بوارێکو لە کاتێکدا جوانن خۆ ئەگەر بەیەك ڕوانین لە هەمووان بڕوانیت، تەنیا ئەوان لە دەوروبەرت دەبێت کە وەك خۆتن.



# هێرشی کەروێشکەکان!

جەلال عەبدوڵا حاجی

مــرۆڤ باشــترینو کامڵترین دروســتکراوی خودایــە، عەقڵو ژیری پێبەخشــیوە، خوای گەورە پێش ئەوەی مرۆڤ لەسەر ڕووی زەویــدا دابنێت ژینگەکەی بــۆ لەبارکرد، تا بتوانێــت بژی تێیدا، بەجۆرێــك هەمــوو ڕووەكو گیانلەبــەرانو بێگیــان لــە خزمەتی مرۆڤدایــە، هاوســەنگی ئــەو ژینگەیەی بــۆ دەپارێزێــت، ڕووەك خۆراك دروســتدەکاتو کرمو مێروو لەســەر ڕووەك دەژین، پاشان چۆلەکەیــەك ئەم کــرمو مێرووانــە دەخوات، چۆلەکــەش دەبێت بەنێچیری واشــەیەك، واشــەکە پاش مردنی زینــدەوەری تاکخانە لاشەکەی شیدەکەنەوەو دەگەڕێتەوە سرووشت، بەم جۆرە زنجیرەی خۆراك دووبارە دەبێتەوە.

مــرۆڤ لــە ئەنجامــی هەڵســوکەوتو چالاکی ڕۆژانــەی ئەم هاوسەنگییە دەگۆڕێت، بەتایبەت کاتێك زیادەڕۆیی دەکاتو دەبێتە هــۆی تێکچوونی ژینگە، ئەوی کێشــەکە قورســتر دەکات نائاگایی مرۆڤە بە دەرئەنجامی ئەو کارەی کە دەیکات لە دەستکاری کردنێکی سادەی ئەم هاوسەنگییە ژینگەییە، لێرەدا نمونەیەك دەهێنمەوە کە مرۆڤێك بۆ خۆشــی خۆی ئەنجامی دا، بەڵام بوو بە هۆی کێشە بۆ خەڵکانی ئەو وڵاتەو نەوەی دوای خۆی تائێستاش هەربەردەوامە.

ئوســتراليا وڵاتێکــی پــانو بەرینــە، ڕووەكو گیانلەبەرەکانی جیاوازن لە هەرشوێنێکی تری دونیا، تاوەکو ساڵی ١٨٥٠ ژمارەیەکی کەم کەروێشــك لە ئوســترالیادا هەبــوون، لەو ســاڵدا پیاوێك کە نــاوی تۆماس ئۆســتن (**Thomas Austin**) بوو لە بەریتانیاوە گەشــتی کرد بۆ ئوســترالیا، حەزی لە ڕاوی کەروێشــك بوو، بۆیە داوای لــە برازاکــەی کــرد کە لــە بریتانیابــوو (٢٤) کەروێشــکی لەشســاغو تەندرووســتی بۆ بنێرێت لە ڕێگەی کەشتییەوە، کاتێك کەروێشــکەکان گەیشــتنە دەســتی، تۆماس ئۆســتن لە کێلگەکەی خۆیدا کەروێشکەکانی بەرەڵاکرد، لەبەرئەوەی کەروێشك بەخێرایی زۆردەبێت، هەر کەروێشکێك دەتوانێت لە ساڵێکدا (٣٠ بۆ ٤٠) بەچکە بــکات، هەروەها گیانلەبەری تــر نەبوو بیانخوات، کەروێشــکەکان بەخێرایی چەند هێندەبوونو بەئوسترالیادا بڵاوبوونەوە، لە ساڵی ١٨٨٠دا کەروێشــکەکان بوون بە گرفتێکــی گەورە لە وڵاتدا، چونکە ئــەو ڕووەکانەیان دەخوارد کــە جوتیــارەکان دەیانچاند، هەروەها گژوگیایەکــی زۆریان دەخوارد، بە جۆرێك خۆراك بۆ گیانلەبەرانی تــر نەدەمایەوە، دەبوونە هــۆی تێکدانی خاكو نەمامەکانیشــیان دەخوارد.

خەڵکی ئوســترالیا هەوڵیاندا بە زۆر ڕێگە کۆنترۆڵی زۆربوونی کەروێشــکەکان بکەن، لە ســاڵی ١٩٠٧ پەرژینێکیان دروست کرد بە درێژایــی ٢٠٠٠ میل بۆ بەربەســتکردنی هێرشــی کەروێشــکەکان، بەڵام ئەمەش نەیتوانی ڕێگری لە هاتنیان بکات، لە ســاڵی ١٩٥٠دا ژمــارەی کەروێشــکەکان گەیشــتە ٦٠٠ ملیــۆن کەروێشــك، بۆیە زانــاکان هەوڵیاندا نەخۆشــی بڵاوبکەنەوە لەناو کەروێشــکەکاندا، بەمەبەســتی کەمکردنەوەی ژمارەیان، نەخۆشی نزیکەی نزیکەی ٥٠٠ ملیۆن کەروێشــکی لەناوبرد، بەڵام جارێکی تر لە ساڵی ١٩٩١ دا ژمارەی کەروێشــکەکان بەرزبوویەوە بۆ ٢٥٠ ملیۆن، ئێســتا ژمارەی کەروێشــکەکان کەم بووەتــەوە، بەڵام وڵاتەکە کێشــەی بەردەوامی هەیە لەگەڵ کەروێشکدا، هەمووی دەگەڕێتەوە بۆ ٢٤ کەروێشکەکەی کە تۆماس ئۆســتن هاوردەی کردن بۆ ئوسترالیا، خەڵکی ئوسترالیا بەتایبەت جوتیارو خاوەن ئاژەڵەکان زۆر توڕەن بەرامبەر بەوکارەی ئەو، چونکە کەروێشکەکان هەمووساڵێك هێرش دەهێننەوە.

# جبران خليل جبران



ئالانی

کەم کەس هەیە لە جیهاندا ناوی (جبران خليل جبران)ی نەبیستبێت، جبران خليل فەیلەسوفو ئەدیبو شاعیرو نیگارکێش بووە، لە خێزانێکی هەژارو کەمدەرامەت لە ٦ کانونی دووەمی ساڵی ١٨٨٣ لە شارۆچکەی (بشری) لە باکوری لوبنان لە دایکبووە. هەرکات باس لە زاناو ناوداران دەکرێت، ناڕەحەتیو نەهامەتیمان بیردێتەوە، چونکە سەرجەم زانایانو ناودارانو فەیلەسوفو بیرمەندەکانی جیهان بەدەست ناڕەحەتییەکانی ژیانو نەهامەتیو دەردەسەریو ئێشو ئازارەکانی دەروونو جەستەوە ناڵاندوویانە لە ڕێگەی گەیشتن بە هیواو ئاواتەکانیانو دۆزینەوەی نهێنییەکانی ژیانو دەستخستنی زانستو زانیاری.. جبران خەلیلیش یەکێك بووە لەوان.

**ژيانو گەورەبوونی..** باوکی جبران خليل هاوسەری سێیەمی دایکی بووە، لە هاوسەری پێشووی کوڕێکی هەبووە بە ناوی (بوتروس)، پاشان جبرانو دوو خوشکی بە ناوەکانی (مریانا و سلتانە) هاتوونەتە دونیاوە.

باوکی جبران شوانی مەڕو ماڵات بووە، بەڵام زۆربەی کاتەکانی ژیانی بە مەستیو سەرخۆشی بەسەربردووەو گرنگی بە خێزانەکەیو منداڵەکانی نەداوە.

(کمیلە) دایکی جبران لە خێزانێکی ڕێزدارو ئاینپەروەر بووە، هەموو کات بە دەست گرفتەکانی داراییو مەعنەویو سۆزدارییەوە ناڵاندوویەتی، لەبەرئەوە جبرانی نەناردۆتە قوتابخانە، بەڵکو جاروبار دەینارده لای قەشەی شارۆچکەکە، قەشەش هەر زوو زیرەکیو لێهاتوویی جبرانی بۆ دەردەکەوێت، لەبەرئەوە ڕۆژانە کاتی زۆری بۆ فێرکردنی خوێندنەوەو نووسین بۆ جبران تەرخان دەکرد.. ئەمەش بووە هۆی ئەوەی بەردەمی والابێت بۆ موتالاکردنو شارەزابوون لە مێژوو زانستو ئەدەب.

لە تەمەنی (١٠) ساڵیدا، جبران لەسەر بەردێکی گەورەی دۆڵی قادیشا کەوتە خوارەوەو شانی چەپی شکا، کە درێژایی ژیانی بەدەست ئەو ئازارەوە ناڵاندویەتی.

خێزانی جبران خليل، هەر بەدەست هەژاریو نەداریو بێموبالاتی باوکیانەوە نەیاندەناڵاند، بەڵکو کاتێك سوپای عوسمانییەکان ساڵی (١٨٩٠) هاتن، باوکی واتە (خليل جبران) یان دەستگیر کردو ڕەوانەی زیندانیان کرد، دایکی ناچار ماڵە بچکۆلەکەیانی فرۆشتو بەناچاری چوونە ماڵی کەسە نزیکەکانیان..

لەو ساتانەدا دایکی جبران، بۆ ڕزگاربوون لەو گرفتەی دوچاریان هاتووە بیری لە ڕێگە چارەیەك کردەوە، دواجار بڕیاری دا کە کۆچ بکەن بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، بە مەبەستی گەڕان بە دوای ژیانێکی باشترو شایستە تر.

ساڵی (١٨٩٤) خليل جبران لە زیندان ئازادکرا، بەڵام ئەو دوودڵ بوو، سەبارەت بە کۆچکردن بۆ ئەمریکا، بەڵام دایکی جبران سوربوو لەسەر کۆچکردنیان بۆ ئەمریکاو کۆتا بڕیاری لەو بارەیەوە دا، ئەوان کۆچیان کرد بۆ شاری بۆستن کە زۆرترین ڕەوەندی لوبنانی لێبوو، هەر بەهۆی ئەوەوە بوو، دایکی لەو شارە هەستی بە غەریبایەتی نەدەکرد، بە زمانی عەرەبی لەگەڵ دراوسێکانیدا دەدوا، پەیڕەوی ئادابو نەریتەکانی لوبنانیان دەکرد.

دایکی جبران وەك فرۆشیارێکی دەستگێڕ هەروەك زۆرێك لە ڕەوەندە لوبنانییەکان لە شەقامەکانی شاری بۆستندا، لە پێناوی پەیداکردنی بژێوی منداڵەکانیدا کاری دەکرد.. براکەشی بوتروس دوکانێکی بچکۆلەی دانا..

جبرانیش ڕووی لە خوێندن کرد، لە کاتی داخلکردنیدا ناوەکەی بە هەڵە تۆمار کرا، لە بری جبران بە (خليل جبران) واتە بەناوی باوکییەوە تۆمارکرا، لەبەرئەوەیە کە لە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا بە خليل جبران ناسراوە..

هەرچەندە جبران چەند جارێك هەوڵی ڕاستکردنەوەی ناوەکەی دا، بەڵام لە هەوڵەکانیدا سەرکەوتوو نەبوو.

کێشەو گرفتو ناڕەحەتییەکانی ژیان بەردەوام بوو، سلتانەی خوشکی دوچاری نەخۆشیی سیل هاتو بەو هۆیەوە گیانی لەدەست دا.. دوای ساڵێك براکەی بوتروس بەهەمان نەخۆشی کۆچی دوایی کرد، دواتر دایکی بە نەخۆشیی شێرپەنجە کۆچی دوایی کرد.. تەنها ماریانای لەگەڵدا مایەوە کە ئەویش ناچار چوو بۆ پێشانگایەکی بەرگدروون بۆ کارکردن.

لەو کاتانەدا بوو، کە بارودۆخی سەختی ژیان تەواو تەنگی پێ هەڵچنیبوون، سەرکەوتنو دەرکەوتنی جبران هاتەئاراوە، سەرەتا پێشانگایەکی بۆ تابلۆکانی کردەوە، جبران زۆرتر لە تابلۆکانیدا باسی لە مەرگو ئازارەکانی ژیان دەکرد..

خەمو ناڕەحەتییەکان چۆکیان بە جبران دانەدا، بەڵکو ڕۆژ لەدوای ڕۆژ سەرکەوتنەکانی جبران لە گەشەسەندندا بوو، تا ئەوەی بووە خاوەنی چەندین بەرهەمی هونەریو دانانی چەندین کتێب لە نێویاندا کتێبی (النبي) کە بۆ زیاتر لە (٢٠) زمان وەرگێڕدراوە.

لە ١٠ ئەپریل ساڵی (١٩٣١) لە نیویۆرك بە نەخۆشیی سیل کۆچی دوایی کرد!

گوڵان حەمەئەمین

# ترسی چوونە قوتابخانە لای منداڵان

خوێنەرانی زێدە ئەزیز، دایکانو باوکانو پەروەرشیارانی خۆشەویست، ئەوانەی منداڵەکانیان دەترسن لەچوونە قوتابخانە بێگومان وێڵن بەشوێن هۆکارەکەیدا دەتانەوێت بزانن چ هۆکارێك وای کردووە منداڵەکەت بترسێت لەچوونی بۆ قوتابخانە لە کاتێکدا ئێوە بە پەرۆشەوە چاوەڕوانی ئەو ڕۆژەتان دەکرد.

دەبینین بەشێك لە منداڵ کاتێك تەمەنی چوونی بۆ قوتابخانە نزیك دەبێتەوە، بەردەوام ڕەتی دەکاتەوە کە بچێت بۆ قوتابخانەو دەڵێت: من ناچم بۆ قوتابخانە، کاتێکیش زۆری لێدەکرێو بە زۆر دەیبەن بۆ قوتابخانە دەگریو دەگەڕێتەوەو دەبێتە گرفت بۆ خانەوادەو قوتابخانەو مامۆستاکانی.

چەند هۆکارێکی دڵەڕاوکێو ترسی منداڵ لە چوونە قوتابخانە دەخەینە ڕوو، هەندێکی پێش چوونە قوتابخانەیەو دواتر باش دەبێت، هەندێك لەو ترسانە لەدوای چوونە قوتابخانە دروست دەبێت، لە ڕوانگەی ڕاوبۆچوونی زانایانو پسپۆڕانو توێژەرانی بوارەی دەروونی منداڵان، لەوانەش:-

۱- نازپێدانی زیاد لە پێویست:-

زیادەڕۆییو ڕۆتین لە پەروەردەی ئەو منداڵە، وای لێدەکات تەمەڵی بەشێوەیەکی گشتی بەسەریدا زاڵدەبێت تاوای لێدێت نەتوانێت بەیانیان لەخەو هەڵسێت، ناتوانێت جانتاکەی شانی هەڵگرێت، ناتوانێت ئەرکەکانی بنوسێتەوە، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ فێرنەکردنو ڕانەهێنانی قۆناغبەندیی پێشتر.

۲- چاودێری نەکردنی منداڵ لەلایەن خانەوادەوە:-

هەندێجار بەهۆی ترسێك لە ڕێگاوبان، یان لەنێو قوتابخانەدا، منداڵانی لە خۆی گەورەتر ترساندوویانە، یا شێوازی مامەڵەی مامۆستاو بەڕێوەبەر هەندێ منداڵ بە ناسکییەکی زۆر پەروەردەکراوە بە دەنگ بەسەردا بەرزکردنەوەیەك توڕەبوونێك ترسی بۆ دروست دەبێت.

۳- لاوازی ئاستی فێربوونی هەندێ منداڵ:-

وەك ئاشکرایە ئاستی فێربوونی تاکەکان جیاوازە منداڵیش ئەو ڕاستییە نازانێتو قبوڵی بکات، یاخود هەیە لە ماڵەوە چاوەڕوانی نمرەی بەرزی لێدەکەن، ئەویش لە کاتێکدا توانای بەدەستهێنانی نییە قوتابخانەی لادەبێتە دێوەزمەو حەز دەکات لێی دوور بکەوێتەوە.

٤- ترسان لە سزادان هەندێجار مامۆستایەك دەڵێت:

هەرکەسێکتان نەیزانن لێتان دەدەم، یان دەری ناچێنم، یا...، یاخود خانەوادە هەڕەشەی سزادانی لێدەکەن، ئەمەش وادەکات بترسێت زۆرجار خۆی نەخۆش دەخات بیانوو دەهێنێتەوە بۆئەوەی نەچێتەوە بۆ قوتابخانە.

ئازیزان ئاشکرایە بەرەچاوکردنی ئەو هۆکارانەو هەروەها ئەو ئامادەباشییانەی لە تەمەنی چوارساڵییەوە باسمان لێوەکردووە، دەبێتە چارەسەر بۆ ئەو گرفتە کە ڕووبەڕووی نەوەکانمان دەبێتەوە لەو تەمەنە ناسكو هەستیارەدا، بە هیوای نەوەیەکی چالاكو تەندروستو بێگرفت بۆ هەموو لایەك.



# خەوی ترسناك لای منداڵان

و: ڕێڤان عەلی

هۆکاری سەرەکی کابوس لە منداڵدا ڕەنگە کاریگەری ئەو دیمەنە ترسناکانە بێت کە منداڵ بە درێژای ڕۆژ لە تەلەفزیۆندا دەیبینێت، یان لەو داستانو کتێبانەی لە دەورووبەرەوە دەیبیستێت.

لەم کاتەدا بە هۆی بینینی خەوی ترسناکەوە بەخەبەردێتو لەسەر جێگای نووستنەکەی دادەنیشێتو بە دەنگی بەرز هاوار دەکات، یان دەگریو داوای یارمەتی لە دایکو باوکی دەکات.

هەر کابوسێك بەو واتایە نییە یەکێك لەم هۆکارانەی سەرەوە بوونی هەبێت، دەگونجێ تا، نەخۆشی، زیاد، یان کەمخۆری کاریگەریی گرنگی هەبێت.

پێویستە بەم شێوازانە دایکو باوك کاردانەوە پیشان بدەن لە کاتی بینینی خەوی ترسناکی منداڵەکانیان:

کاتێك منداڵ لە نیوەشەودا هاواری کرد بێئەوەی بەخەبەر بێت، دەبێت بلاوێنرێتەوەو بە ئارامی لایلایەی بە گوێدا بوترێت، تا دەکرێ لە خەو بەخەبەر نەکرێتەوە.

بەڵام کاتێك بە دەنگی هاواری خۆیەوە بەخەبەرهات دیارە ترساوە، دەبێت لە باوەش بکرێتو پەرداخێك ئاوی ساردی پێ بدرێت، بەدەنگێکی هێواش پێی بڵێی ئەوەی دیوتە تەنها خەونێك بوەو تێپەڕی. تەنانەت ئەگەر واتای *خەون* هێشتا فێرنەبووبێت، ئاوازی ئارام بەخشی دەنگتان هێوری دەکاتەوەو تێدەگات ئەوەی دیویەتی ڕاستەقینە نییە، ئەگەر دیسانەوە بەخەبەرهات دەتوانن گڵۆپێك بکەنەوەو بڵێن وەرە بگەڕێین بۆ ئەو شتەی لێی دەترسیت، یان پێی بڵێن ئەگەر خەونت بە ئەژدیهاوە دیوە لە کۆتایدا بەو شمشێرەی پێت بوو ئەژدیهاکەت کوشت.

ئەڵبەتە دەبێت لە خودی منداڵەکە خۆی یارمەتی وەربگرنو بە سەرنجەوە چەند پرسیارێکی لێ بکەن بۆ نموونە: دوێنێ چ خەونێکت دی؟ یان لەچی دەترسی؟ ڕێگە بدە خۆی باسی بکاتو هەوڵ بدەن بەوردی گوێی بۆ بگرنو قسەکانی پێ نەبرن، بۆئەوەی منداڵ بەم کارە هەست بە ئارامی دەکات.

ڕێگا چارەکان

شەوانە هەوڵبدەن هەمیشە گڵۆپێك لە ژووری نوستنی منداڵ کراوە بێت، پێش ئەوەی بنوێت پێکەوە ئاماژە بۆ کەلوپەلەکانی ژوورەکەی بکەن بۆ نموونە: سێبەری کورسییەك ڕەنگە هۆی ترس بێت بۆ منداڵ. دەشتوانن بووکەڵەیەکی پێ بدەن، یان لە ژوورەکەیدا بۆی هەڵواسنو پێی بڵێن ئەم بوکەڵەیە ڕێ لەوە دەگرێ خەونی خراپ ببینی.

هەوڵ بدەن منداڵ پێش نووستن فیلمی ترسناك نەبینێت، پێویستە چیرۆکێکی گونجاوی بۆ بخوێنرێتەوەو پێی بڵێن: ئومێدەوارم ئەمشەو ئەم چیرۆکە بە خەون ببینی.

دەتوانن پەیوەندییەکی رۆحی باشو ئارام پێش نوستن بۆ منداڵ فەراهەم بکەن.

سەرچاوە: سایت کودکان/ دستە: روانشناسی رشدوآموزش



# نەدارێك لە ماڵی پێشەوادا

ئا: محەمەد مێرگەیی

بە خەمبارییەوە لەماڵەکەی دانیشتبوو، چونکە سەرجەم سەروەتو سامانەکەی لەدەست دابوو، کاتێك هاوسەرەکەی بەمشێوەیە ئەوی بینی، پێی گوت: خەڵکی هەمیشە باس لە چاکەو سەخاوەتو بەخشندەیی پێشەوای شارەکەمان دەکەن، دەتۆش بڕۆ لایو حاڵی خۆتی پێ ڕابگەیەنە، بەڵکو ئەویش فەرمان بدات شتێکت پێبەخشرێت. پیاوەکە بەهۆی ڕەوشتبەرزیی خۆیەوە، سەرەتا ئەمەی ڕەتکردەوە، بەڵام هاوسەرەکەی بەردەوام پێداگری کرد تاکو دواجار پیاوەکە ڕازی بوو.

ئەوەبوو پیاوە هەژارەکە چووە ماڵی پێشەواو لە کۆڕو مەجلیسی ئەودا دانیشت، کات تێپەڕیو هەموو خەڵکی مەجلیسەکەی پێشەوا ڕۆیشتن، ئەو هەر بەبێدەنگی لەوێ مایەوە، پێشەوا پێی گوت: وەها تێدەگەم دانیشتنەکەت بۆ داواو پێویستییەکە، بەڵام پیاوە هەژارەکە هیچ وەڵامێکی نەدایەوە، ئەگەرچی لە مەجلیسەکەی پێشەوادا کەس نەمابوو تەنها خزمەتکارەکان نەبێ، بۆیە پێشەوا فەرمانی بە ئەوانیش کرد بچنە دەرەوە، ئینجا بە پیاوەکەی گوت: ئێستا هەر تەنها منو تۆ لێرەین، داواکارییەکەت چییە پێم بڵێ؟ هەمدیسان پیاوەکە هیچ قسەی نەکردو بێدەنگ بوو، ئەمجارە پێشەوا چراکەی ئەوێی کوژاندەوەو گوتی: ڕەحمەتی خوات لێبێت ئەی پیاو، ئەوە ئێستا ڕووخساری منیش نابینیت، پێویستییەکەت چییە پێم بڵێ؟

ئیتر پیاوەکە هێزێکی دایە بەر خۆیو گوتی: خودا پاداشتت بداتەوە، ئەی پێشەوا، لە ڕاستیدا تووشی هەژارییو دەستکورتی بووین، هاتووم بە تۆی ڕابگەیەنم، بەڵام ئەدەبو شەرمم ڕێگەی پێ نەدام. پێشەواش پێی گوت: سبەینێ بڕۆ لای ڕاسپێردراوی منو لەوێ پێویستییەکەت جێبەجێ دەبێت.

ئەوەبوو بۆ بەیانی ڕۆژی دواتر، پیاوەکە چووە لای ڕاسپێردراوی پێشەوا، ڕاسپێردراوەکەش پێی گوت: پێشەوا فەرمانی بەخشینی شتێکی داوە بە تۆ، بڕۆ یەکێك بێنە لەگەڵتدا هەڵی بگرێت، پیاوەکە گوتی: کەسێکم نییە لەگەڵمدا بێت، ئینجا ڕۆیشتو دڵخۆشییەکەی نەما، ئەو وا هەستیکرد پێشەوا فەرمانی کردووە تەنها کیسەیەك ئارد، یان خواردنی پێ بدەن، کە گەڕایەوە ماڵەوە بە ژنەکەی گوت: لەبەر پێداگریی تۆ چوومە لای پێشەوا، ئەویش فەرمانی کردووە بە شتێك کە پێویستە بە کۆڵ هەڵبگیرێت، کەواتە ئەمە شتێکە لە ئارد، یان خواردن. ژنەکەی گوتی: هەتاوەکو ئەگەر بەخشینەکەی پێشەوا تەنها ئارد، یان خواردنێك بێت، ئەوا ئێمە پێویستمان پێیەتی.

پیاوەکە گەڕایەوە لای ڕاسپێردراوەکەی پێشەوا، ڕاسپێردراوەکە پێی گوت: بە پێشەوام ڕاگەیاندووە کەوا تۆ کەسێکت نییە بەخشینەکەت بۆ لە کۆڵ بکاتو هەڵی بگرێت، بۆیە ئەویش فەرمانیداوە کە سێ خزمەتکارت لەگەڵدا بنێرم. ئەوەبوو خزمەتکارەکان بەخشینەکەی پێشەوایان هەڵگرتو بردیانەوە بۆ ماڵی پیاوە نەدارەکە، بارەکانیان دانا، پیاوەکە زۆر سەری سوڕما کە بینی هەر یەکێك لە خزمەتکارەکان، دە هەزار درهەمی هەڵگرتووە، خەریکبوو لە خۆشییان باڵبگرێت، بە خزمەتکارەکانی گوت: بارەکان دابنێنو بڕۆنەوە، خودا پاداشتتان بداتەوە، بەڵام ئەوان گوتیان ناڕۆین، چونکە نەریتی پێشەوا وەهایە ئەگەر دیارییەك بە خزمەتکارەکانی بۆ یەکێك بنێرێت، ئەوا خزمەتکارەکانیش هەر دەبنە بەشێك لە دیارییەکە!

ئەو پێشەوا سەخیو بەخشندەیە، پێشەوای شاری مەدینە (سەعیدی کوڕی عاص) بوو، ئەو لەو کاتەی کە هێشتا منداڵێکی بچوك بوو، جارێکیان ژنێك پۆشاکێکی هێنایە لای پێغەمبەر (ﷺ)و پێی گوت: من نەزرم کردووە ئەم پۆشاکە بدەم بە بەڕێزترینی کەس، پێغەمبەریش (ﷺ) ئاماژەی بۆ سەعید کردو بە ژنەکەی فەرموو: بیدە بەو منداڵە.

سەرچاوە: گۆڤاری (ماجد)، ژمارە ١٨٤١، ساڵی ٢٠١٤.



# منداڵ بەخششی خوایە

ئەمیر ئەحمەد عەبدولقادر

ژنێـك هەوڵـی دەدا خۆی لە كۆرپەلەكـەی رزگار بكات، بەڵام بـوو بە دەردەسـەری، ژنەكە بـە دكتۆرەكەی گـوت: ئایا دەتوانی نەشـتەرگەریم بۆ بكەیت بۆ لەباربردنی كۆرپەلەكەمو رزگاربونم لێـی؟ لە نۆرینگەیەكی ژنانە یەكێك لە خاتوونەكان چووە بەردەم پزیشكی ئافرەتان و بەبێزاریەوە پێی گوت: من پێویستم بە یارمەتی تۆیە، منداڵی یەكەمم ئێستا ساڵی یەكەمی تەواو نەكردووە، منیش دووگیانم بـە منداڵی دووەم، ناتوانم بەرپرسـیارێتی دوو منداڵی بچوك هەڵبگرم سـەرەڕای بەرپرسـیارێتییەكانی تریشـم، بۆیە دەتوانی یارمەتیم بدەی؟؟

پزیشكەكە وەڵامی دایەوەو گوتی: ئەوە چۆن دەكرێت؟؟

دایكەكـە لە وەڵامدا گوتی: ئایا دەتوانی نەشـتەرگەری لەباربردنی كۆرپەكەم بۆ ئەنجام بدەیت بۆ رزگار بوونم لێی؟!! پزیشكەكە ماوەیەك بێدەنگ بوو ئینجا گوتی: بەڵام ئەو كارە ژیانت دەخاتە مەترسـییەوە، رات چییە بە رێگە چارەیەكی گونجاوترو سەلامەتتر؟

دایكەكـە دوای ئـەوەی لەوەڵامی پزیشـكەكە دڵنیابوو بە دڵ خۆشییەوە گوتی: ئەم رێگەچارەیە كامەیە؟

پزیشـكەكە گوتی: لەبەرئەوەی تۆ ناتوانیت بەرپرسیارێتی دوو منداڵ لەیەك كاتدا بگریتە ئەستۆ، بۆیە دەتوانین خۆمان لە منداڵی یەكەم دەرباز بكەیـنو كۆرپەلەكەش بهێڵینەوەو بەمەش تۆ خۆت دوچاری نەشتەرگەری ناكەیتو دەبیتە دایكی تەنها یەك منداڵ!!

دایكەكە بەترسـەوە وەڵامی دایەوە: ئەسـتەمە، تۆ دەڵێی چی، ئەمە تاوانە. ئایا تۆ دەزانیت باسی كورەكەم دەكەیت؟

پزیشـكەكە بە هێمنییەوە گوتی: پێم وابوو ئەم رێگە چارەیە باشـترە، چونكە هەردووكیان منداڵی تۆنو هیچ جیاوازییەك نییە لە نێوان كوشـتنی منداڵێكی شـیرە خۆرەو كۆرپەلەیەك كە جارێ رووناكی جیهانی نەبینیوە لە هەردوو بارەكەدا یەكێكیانت دەمرێ...

دایكەكە بەسـەری خۆی داداو لە نیازو مەبەسـتی پزیشكەكە گەیشـتو نۆرینگەكەی بەجێهێشـت، دوای ئەوەی وادەی سەردانی مانگانەی تۆماركرد...

منـداڵ بەخششـی خودایە، تەنهـا ئەوانە نرخـی دەزانن كە بێبەشـبوون لەم بەخششـە، ئەی خودای بەخشندە وەچەی باشو رەسەن ببەخشە بەسەرجەم ئافرەتانی مسوڵمان.



# ڕاڤەی ئەو حەوت خەوەی کە زۆر دووبارە دەبنەوە

و: سەلمان کانەبی

کاتێك شەوانە دەخەوین زۆرجار بەیانیان لەپڕ هەڵدەستین هەندێك وێنەی نامۆمان لادروست دەبێت، کە خەیاڵمان لە کاتی خەوتندا دروستیان دەکات، بەڵام ئەوەی ئێمە نایزانین ئەوەیە کە ئەو وێنانە بە هەڕەمەکیو لەخۆوە دروست نەبوون لامان، بەڵکو لە هەستەکانمانو بیرۆکەکانمانو ترسی شاراوەمان سەرچاوەیان گرتووەو نەستی شاراوەمان (لاوعی) لە شێوەی خەو نیشانمان دەدات.

ئێستا با بزانین کە ئەو خەوانەی زۆر بڵاونو دەورەی هەموومان دەدەن چین، هەروەها با بزانین ڕاڤەی ئەو خەونانەش بە پێی لێکدانەوەی دەروونناسان چییە؟

١- خەو دەبینیت کە تۆ ونبوویت، یان لە شوێنێك هەڵواسراویتو گیرت خواردووە:- ونبوون لە خەودا زۆر ڕوو دەدات، ئەویش بە زۆر شێوە بۆ نمونە لە خەودا هەوڵ دەدەیت ڕێگەیەك بدۆزیتەوە بۆئەوەی لە دارستانێکدا دەربچیت، یان لە شەقامێکی شار، یان لە بینایەکی گەورە، یان دەکەویتە ناو تەڵەیەکەوە، یان ناتوانیت جوڵە بکەیت لەبەر هەر هۆکارێك بێت، یانوێنەی ئەوانە، ئەو خەوە هێمایە بۆ ئەوەی تۆ پەشۆکاویتو واقتوڕماوە لە دەرکردنی بڕیارێکی گونجاو کێشەت هەیە دەربارەی چۆنییەتی ڕەفتارکردن لەگەڵ بارودۆخو هەڵوێستێك لە ژیاندا، یان تۆ بەندی هەندێك کاروباریت کە پێویستە لەسەرت جێبەجێیان بکەیت.

٢- خەو دەبینیت کە لە تاقیکردنەوە دەرناچیت:- هەتا ئەگەر ماوەیەکی زۆریش بێت لە قوتابخانە دابڕابیت هەر توشی ئەم خەوە دەبیت، زۆر سیناریۆی جۆراوجۆر هەن بۆ ئەو خەوانە، بۆ نموونە دەبینیت کە دواکەوتووی لە تاقیکردنەوە، یان ناتوانیت هۆڵی تاقیکردنەوە بدۆزیتەوە، یان ناتوانیت وەڵامی پرسیارەکان بدەیتەوە، ئەم خەوانە ئاماژە بە هەستەکانت دەکەن کە تۆ لە ژێر چاودێری دایتو کەسێك تاقیتدەکاتەوە، یان تۆ ئامادە نیت بۆ گێڕانی ڕۆڵێك لە ژیاندا.

٣- خەو دەبینیت ددانت دەکەوێت:- بابەتی کەوتنی ددان زۆر بڵاوە ئەویش ئەوەیە لە پڕ ددانت دەکەوێت، یان توشی ئازار دەبێت، ئەو خەوە تەنها ترسێنەر نییە، بەڵکو زۆرجار وێنەیەك لای کەسەکە دروست دەکات کە بیری ناچێتەوە، کەوتنی ددان لە خەودا هەندێك جار ڕەنگدانەوەی حاڵەتی ناوەکییە لە دوودڵیو دڵەڕاوکێی کەڵەکەبوو لەلات، بە تایبەت لەبارەی ڕووخساری دەرەکیت، یان ڕوانینو سەرنجی خەڵکی بۆت، کەوتنی ددان لە خەودا ئەوە ئاشکرا دەکات کە ترست هەیە لە قبوڵ نەکردنت، یان واز لێهێنانت بە تایبەت لەلایەن ڕەگەزی بەرامبەرەوە.

٤- خەو دەبینیت کە یەکێك، یان شتێك دوات دەکەوێت:- ئەم خەوە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە تۆ هەست بە ترس دەکەیت لە شتێکی دەرەکی، یان هەستێکی نادیار دوودڵت دەکات.

٥- خەو دەبینیت کە گەشتێك، یان کارێکی گرنگت لەدەست داوە:- بە گشتی ئەوەی ئەو جۆرە خەوانە ئاماژەی بۆ دەکەن ئەوەیە کە تۆ لە ناخەوە پەشیمانیت لەوەی کارێکی گرنگ، یان دەرفەتێکی گرنگت لەدەست داوە لە ژیاندا، یان تۆ لەبەردەم دەرگاکانی هەڵبژاردنێكو قۆناغێکی یەکلاکەرەوەدایت.

٦- خەو دەبینیت کە جلوبەرگت لەبەر نییە، یان شتێکت لەبەرە گونجاو نییە:- تۆ لە شوێنێکی گشتی، یان بە پێی پەتی ڕۆیشتوویت بۆ سەر کار، یان بیجامەت لەبەرە، ئەم جۆرە خەوانە ئاماژە بە هەستت دەکەن کە ئاشکرایت، ئاماژە دەکەن بۆ ئەوەی کە ترست هەیە لەوەی زۆر شتی تایبەتی خۆتت بە یەکێك وتووە.

٧- خەو دەبینیت کە دەکەویت، یان لە ئاودا نقوم دەبیت:- ئەو خەوە ئەوەی لێدەردەکەوێت کە تۆ هەست بە نائارامیو نا دڵنیایی دەکەیت، هەستدەکەیت کە پاڵپشتت لەدەستداوەو کارەکانت باش ناڕۆن بەڕێوە لە ژیاندا، وەك ئەوەی تۆ خەریکە خۆت بە دەستەوە دەدەیت لە ڕووبەڕووبونەوەی گوشارو پاڵەپەستۆو کێشەکان.

# ملوانکەی مرواری!

ئەسکەندەر ڕەحیم

دەگێڕنەوە لە وڵاتی فەرەنساو لە شارۆچکەیەکدا، کیژۆڵەیەکی جوان بەناوی (سۆفیا)و کوڕێکیش بەناوی (پاتریک) هەبوون. (پاتریک) بەهرەیەکی گەورەوگرانی لە وێنەکێشاندا هەبوو، بە چەشنێك هەمووان بڕوایان وابوو، داهاتوویەکی پڕشنگدار چاوەڕێیەتیو ئامۆژگارییان دەکرد، بچێت بۆ پاریسی پایتەخت.

ئەو دەمەی تەمەنی (پاتریك) گەیشت بە بیست ساڵان، ژیانی هاوسەرێتیی لەگەڵ (سۆفیا)دا پێك هێناو بڕیاریاندا پێکەوە بچن بۆ پایتەختی پڕڕووناکی، تا (پاتریك) ببێت بە وێنەکێشێکی مەزنو (سۆفیا)ش بە نووسەرێکی ناودار.

ئەم دوو هاوسەرە لە پاریس، لە خانوویەکی جوانو خۆشدا نیشتەجێ بوونو وردە وردە دەستیان کرد بە بەدیهێنانی ئامانجەکانیان.

لەو کۆڵانەی تێیدا نیشتەجێ بووبوون، (سۆفیا) ئاشنایەتی لەگەڵ خاتوونێکی دەوڵەمەندی نەرمونیانی ڕەفتارجواندا پەیدا دەکات.

ڕۆژێك (سۆفیا) بەمەبەستی چوون بۆ زەماوەندێك لە شارۆچکە کۆنەکەی خۆی، داوای ملوانکەیەکی گرانبەها لەو خاتوونە دەکات، تا ئەو کاتەی دەگەڕێتەوە، پێی بدات

خاتوونی خوداپێداویش ڕازی دەبێت، ملوانکەیەکی مرواری پێدەداتو ئامۆژگاریی دەکات کە جوان ئاگای لێبێتو بیپارێزێت؛ بەڵام (سۆفیا) کە دەگەڕێتەوە بۆ پاریس، سەیر دەکات ملوانکە گرانبەهاکەی لێکەوتووە، قوڵپی گریان دەیگرێتو (پاتریك)یش لە تاو ئەم بەڵا دڵکوتە، ئاگای لە خۆی نامێنێت.

پاش هاتنەوە سەرخۆو پاش لێکدانەوەی ئەو ڕێچارانەی لەبەردەستیاندایە، بڕیاریاندا ملوانکەیەکی نوێ بە هەمان تەرزو شێوە، بۆ ئەو خاتوونە دەوڵەمەندە بکڕنەوە، تا ڕووزەردی لای ئەو نەبن.

بۆئەوەی ئەم کارە ئەنجام بدەن، هەرچییان هەبوو فرۆشتیانو قەرزێکی زۆریان کرد بە سوو (ڕیبا). بە خێرایی ملوانکەیەکی هاوشێوەیان کڕیو گێڕایانەوە بۆ خاتوونەکە، بێئەوەی هەست بکات کە ئەمە ملوانکەکەی خۆی نییە. بەڵام ئەو قەرزەی لەسەر شانیان بوو، هێجگار زۆر بوو، کەڵەکەبوونی سوودەکەشی لەولاوە بوەستێت. لەبەرئەوە خانووە خۆشەکەیان بەجێ هێشتو بنەوبارگەیان بۆ ژوورێکی نالەبار لە گەڕەکێکی پیسو پۆخڵ گواستەوە.

بۆ ئەوەی قەرزەکەیان بدەنەوە، (سۆفیا) دەستی لە خەونە کۆنەکەی هەڵگرتو بوو بە خزمەتکاری ماڵان. هەرچی (پاتریك)یش بوو، وازی لە وێنەکێشان هێناو لە بەندەری کەشتییان دەستی بە کاری کۆڵکێشی کرد.

ئەم دوو هاوسەرە بیستوپێنج ساڵیان بەم شێوەیە بەڕێ کرد، تێیدا ئاواتەکانیان لەگۆڕناو تافی لاوییان بەبادا دا. ڕۆژێکیان (سۆفیا) هەروەك ڕۆژانی دیکە، چوو بۆ بازاڕ، تا بڕێك سەوزەو میوە بۆ خانمی ئەو ماڵە بکڕێت، کە کاری تێدا دەکرد. لە پڕ چاوی بە هاوسێ کۆنەکەی کەوتو ئەم وتووێژە لەنێوانیاندا کرایەوە:

- ببورە، ئایە تۆ (سۆفیا)یت؟

- بەڵێ، زۆرم پێ سەیرە، چۆن پاش ئەو هەموو ساڵە، منت ناسییەوە؟!!

- ئەی خودایەگیان، لە حاڵێکدایت کەس ئاواتت پێناخوازێت، کسپە لەدڵمەوە دێت، چیت بەسەردا هاتووە؟ بۆچی لەپڕێکدا لە کۆڵانەکەماندا دیار نەمان؟

- خاتوونە خۆشەویستەکەم، ئەو ملوانکە مرواربیە گرانبەهایەت لەبیرە کە بە سووڕ لێم وەرگرتیت؟ ڕاستییەکەی لێم بزربوو. ئیدی ملوانکەیەکی مرواریی نوێمان بە قەرزی سوو بۆتکڕییەوە، تائێستەش لە ژێر باری ئەو قەرزەداینو لە کۆڵمان نابێتەوە. لەبەر باری قورسی قەرزیش ئەو کۆڵانەمان بەجێ هێشت.

- ئەی خودایەگیان، ئازیزەکەم بۆچی پێت نەگوتم شتێکی وا ڕووی داوە؟ خۆ ئەو ملوانکەیە مرواریی ساختە بوو!

خوێنەری خۆشەویست، لە کۆتاییدا دەڵێم: پێش ئەوەی دەست بە چارەسەر بکەیت، دڵنیابە لەوەی کە کێشەیەك هەیە. کوردیش دەڵێت: سەرێك نەئێشێت، پەڕۆی تێوە مەپێچە!

سەرچاوە: فن إدارة المواقف

# وەفا

ڕۆشنا صاڵح

وشەیەك كورت، بەڵام پڕ بەها، لەگەڵ بیستنی ئەم وشەدا ئێمەی مرۆڤ هەستێكی سەیرو نامۆمان هەیە، ئاخر وەفا سەرچاوەی مرۆڤبوونی مرۆڤەكانە، هۆكاری بەردەوامی پەیوەندییەكانو مانەوەیانە، وەفا خوویەكی جوانو شیرینە كە لە مرۆڤە ئاكار بەرزو بەویقارەكاندا ئەم ڕەفتارە جوانە بەدی دەكرێتو ڕەنگ دەداتەوە لەسەر ژیانیان، چەند شیرینو لەبەردڵانن ئەو مرۆڤانەی وەفامان بەرامبەر دەنوێنن، هەمیشە حەز بەهاوڕێیەتییان دەكەین، هیوا دەخوازین خولەكو چركەكانی ژیانمانیان لەگەڵدا بەسەربەرین، یاخود كاریان بۆڕاپەڕێنین، لە خوامان دەوێت هەلو دەرفەتێكمان بۆ بڕەخسێت، تا خزمەتیان بكەین، هەمووی لەپای یەك شت، ئەویش وەفادارییان، وامەزنو خۆشەویست دەبن لامان، هەمیشە بە كەسێكی خاوەن ڕەوشتو ئاكار جوان ناویان دەبەین، گەر ڕابمێنین لە قورئانی پیرۆزو فەرموودە شیرینەكانی سەروەرمان (ﷺ) بۆمان بەیان دەبێت، چەندە مرۆڤ هاندەدەنو جەختی لەسەر دەكەنەوە، تا بەوەفا بن بەرامبەربەڵێنو پەیمانەكانیان كە داویانە، بەدڵنیاییەوە هۆكاری هەیە كەوا ئەوەندە جەختی لەسەر دەكەنەوە، چون ئەوانەی بێوەفاییان بەرامبەر دەنوێنریت برینێكی قوڵ لە ناخیاندا دروست دەبێت كە سارێژبوونی زۆر زەحمەتە، لەبەرئەوەی بیردەكەنەوە چەندە دڵسۆزانە بەرامبەری ئەم كەسە هەڵسوكەوتیان دەكرد، خزمەتیان دەكرد، هاوكاری بوو تاپرۆژە بە ئەنجام بگەیەنێت، بەدەمیەوە بووە لە ڕۆژگارە تاڵو شیرینەكانی ژیانیدا، كەچی ئەویش لە پاش تەواوبوونو كارپێنەمانی پێی، بێوەفا دەبێت بەرامبەر، یاخود بەڵێنێكی پێداوەو بۆی جێبەجێ ناكات، لەم كاتەدا ئەم مرۆڤە دەروونی پڕ دەبێت لە غەمو ژان، حەسرەت بۆ كاڵفامیو سادەیی خۆی دەخوات، وای لێدەكات بەحەزەربێت بەرامبەر هەموو شتێك، هەموو كەسێك بەبێ وەفا بزانێتو هیچ دڵسۆزییەك بەرامبەر مرۆڤەكان نەنوێنێت، ڕۆحی هاوكاریو خۆنەویستی لەم مرۆڤەدا بكوژێ شكۆی وەفا نەهێڵێت لای، تكایە با هەمووان بە وەفابین بەرامبەر بەڵێنو پەیمانمان، ڕاستە ڕەنگە هەندێ كات تۆ لە بارودۆخیكی وادا نەبیت كە بتوانی ئەو بەڵێنەی پێشتر داوتە بە كەسێك بیبەیتە سەرو كارەكەی بۆ ڕابپەڕێنیت، بەڵام خۆ هیچ نەبێت دەتوانیت پۆزش بهێنیتەوە بۆی تا دڵی بریندارنەبێتو سڵ لە هاوڕێیەتی مرۆڤ نەكاتەوە، زۆر كات ڕاپەراندنی كاریش نییە تەنها سڵاوو هەواڵپرسینێك مرۆڤ ئەوەندە خۆشحاڵەكات كە پێناسە ناكرێت، كاتێك كەسێك بێ هیچ ئیشو كارێك هەواڵو خەبەراتت ئەپرسێت چەند شیرینو ئازیزەبێت لات، لای تۆ دەبێتە جوانترین مرۆڤی دونیا، ئەمەش تەنها لەبەرئەوەی بە وەفابووە بەرامبەرتو هاوڕێتە، یان دۆستێكتەو دەیەوێت بەسەرت بكاتەوەو بەوەفابێت بەرامبەت، هیوا دەخوازم هەمووان بەوەفابین، تا لەمانای جوانی مرۆڤایەتی تێبگەینو خۆمان لای خواو بەندەكانی خۆشەویست بكەین، تا ژیان بەجوانی ببینین.

**گوتت ناری ئەتۆ بمرە ئەمن دێم**
**خودا کەی بێ، خودا کەی بێ، خودا کەی؟**



# ئادابی ئەوین

گەرمیانی

میهرەبان بە ئازیزم میهرەبان، ئەویندار دەبێ میهرەبان بێت!

تۆ دەتەوێت بەرەو دڵێك هەنگاو بنێی، هێدی هێدی برۆ، تۆ دەتەوێت ناخی مرۆڤێك بكەی بە ژوانی هەمیشەییت بە ئەسپایی بدوێ، ئازیزم بە ئەسپایی!

ئیدی تۆ دەبێت لە بوونی خۆت دەست هەڵگری!

سەرەتا كەللەی سەرت فڕێ دە ژێر پێی یار، ئەوسا خۆت بە سالیكی ڕێگای ئەوین بزانە!

تا نەبووری تۆ لەسەر، ڕێی ناخەیە مەیدانی عیشق
سەر لە پێش پێ دەبێ، لەم ڕێگە دانێی "أولا" -مەحوی-

تا لە ڕۆحی خۆت نەبوری، ڕێگای ئەوین نادۆزیتەوە! هەرگیز!

لە ونبوونی خۆتا وجودی یار بەدی دەكەی، لە توانەوەی خۆتا دەگەیتە خزمەتی چرای هەمیشە درەوشاوە! لە فەرمانی عەقڵ دەردەچیتو دەبیتە غوڵامی دڵێك كە ناتوانی هەرگیز موخالەفەی بكەی!

لە هەر جێیەك هەڵێ خورشیدی عیشقی گوڵ روخان
ئەگەر عەقڵی ببێ، لەو جێگە ئاونگی عەقڵ چی بكا؟ -مەحوی-

لەبەر دەرگای كۆشكی ئەوین ڕاوەستە لەسەریەك پێ، تا گوێت لە ناوی خۆت دەبێ، تا دەگەیتە ئەو مەقامەی یار بە ناوی خۆی بانگت دەكات، ئەوكات نەشئەی خۆشییەك ڕوودەكاتە دڵت، كە هەرگیز وەها خۆشییەكت هەست پێ نەكردبێت!

ڕابوردنی ناوی تۆ، بەسەرزاری یاردا ئاوازی ڕۆحە!

تۆیەك دەیان ساڵە وەكو پوشو پەڵاشی پەرێزێكی دێم، قرچە لە جگەرتەوە دێ، بەدەم هەناسەی یارەوە دەكەویتە سەما!

لەبەر زارو نەزاری بوومە وەك پوش
دە ئەمجا، ڕابوێرە، من بە زارا! -مەحوی-

گەر بگەیتە بەردەرگا، ئیدی، خۆڵی ئەو ڕاگوزەرە بە ئاوی حەیات ناگۆڕێتەوە!

ئەوێ بۆ ئەهلی دڵو دەروێشانی تەریقەتی پەروانە، خەونی تەمەنو خەرمانی زەمەنو مونتەهای ئەمەلە!

من چی بكەم لە حەیاتی بێ تۆیی، لە وجودی بێوجودی دوور لە نیشتمانی ڕۆح!

"خضر" ئەگەر چاوی حەیاتی بڕییە ئاوی حەیات
من لە خاكی دەری جانانەمە، هەر چاوی حەیات! -مەحوی-

ڕێگای گەیشتن بەو خاكە تولانییە، كەسێك پەروەردەی ئادابی ئەوین نەبێو لە كورەی ناری عیشقا هەڵنەقرچابێ، ناتوانێ بیگاتێ! دەبێت وێڵی دەشتو دەربێ، مەجنون ئاسا لە كێوو هەردا بۆ لەیلای خۆی وێڵ بێ، دەبێ تەركی دنیا بكاتو لە مرۆڤەكان تارابێو جگە لە یاری خۆی چاوی كەسی دی نەبینێ!

بەجێ نایا دەبێ ڕوكەینە سارا
حەقی ئادابی مەجنونی لە شارا -مەحوی-

ئەو ئادابە ئەستەمە ئەداكردنی، ئەوین دڵی پاكو سینەی سافو پێڵوی شەرمنی دەوێ، ئاهی ساردو ناخی گەرمو جەرگی سوتاوی دەوێ، بەرامبەر بە جەمالی حەقیقی توانەوەو تەسلیم بوونی دەوێ!

بێ دەنگی، ملكەچی، خزمەتكاری، بەخشینی ڕۆح بێ سێو دوو لە سەرەتا ئادابەكانی ئەوینن!!

گفتوگۆ بە زمانی ڕۆح، چرپە بە زمانی پەپوولە، نیگا بە چاوی گوڵ، نەرمی بە وێنەی سروە، ئەمانە سیمای ئەویندارن!

ئای كە سەختە ئازیزم، وانەی ئەم حوجرەیە موتاڵای زۆری دەوێ!

تا من دەبمە خاكو تۆ تەشریف دێنیو پێ دەنێی بەسەرما زۆری دەوێت!!

لەڕێی ئەو شۆخەدا خۆم كردە خاكو پێی نەنا پێ ما
دەسا خاكی هەموو عالەم بەسەر خۆما نەكەم چی بكەم؟! -مەحوی-

من دەزانم بە هەڵە ڕێمكەوتە دیوانی تۆ ئەی شازادەی مەملەكەتی ئەوین!

ڕاوەستانی من لەبەر دەرگای تۆ هیچ مەعقول نییە، وەلێ چی بكەم من خۆ بە عەقڵ شەیدات نەبووم، هەر لە دووری ڕا لەگەڵ پێڵاوەكانمدا عەقڵم فڕێ داو ئیدی ئاوڕم بۆلا نەدایەوە!

بڕا، مەردم دەوێ عەقڵی نەلەنگێ
بە لەنجەی نازو عیشوەی نەونەمامان -مەحوی-

خۆمنیش خەیاڵی هاتنە نێو دیوانم لە مێشكدا نەبوو، من جگە لە پاسەوانو خزمەتكارێك، هیچی دیم بە ئاوات نەدەخواست!

من دەمویست تەنها بەرماڵەكەم لەبەر دەرگای تۆدا ڕابخەمو بە گۆچانێكو جلو بەرگێكی شڕەوە بە پێڵوی چاوەكانم گەردی بەرپێیەكانت بماڵم!

ڕۆژانە ئەگەر پەرداخێك ئاوو لەتێ نانی ڕەقت پێ دابام، ئیدی بەسم بوو!

من بە بوونی تۆ ژیانم بەردەوام دەبێت!

توخوا مەڕۆ.. با ژیانی من هەر بەردەوام بێت، تۆ بڕۆی من ئیدی دەمرم!

من بەس دەمویست لە جوملەی یارانی تۆم قبوڵ بفەرمووی، ئەگەر منیش حەددی ئەوەم هەیە!!

چونكە هەموو كەسێك شایانی ئەوە نییە ڕۆحی قوربانی تۆ بكات!

بێ حیسابن كوشتەیی پەیكانی غەمزەی چاوەكەت
گەر وەكو ئەمثالی ئێمە بێنە سەر حەددو حیساب -ئەدەب-

حەزرەتی شەم، لەم دەروێشە سالیكە بێ سلوكەی خۆت خۆشبە، هێشتا ئادابی ئەوین فێر نەبووە!

بەڵێنت پێ دەدەم ئیدی جگە لە ملكەچبوون، چیدی لە من نەبینی! لەمەودوا..

گلە ناكەم ئەوەندەی دەنكە جۆیی
ئەگەر كەللەی سەریشم پڕلە كاكەی-نالی-

ئیدی هەرچیت دەوێ بیبە، هەرچیت پێ خۆشە بیكە، چیدی نابیسی بڵێم:

هەرچی بووم بردی بە تاڵان توركی مەستی چاوەكەت
تاقەتو سەبرو قەرارم پێ نەما تاڵان بەسە
ئاورت بەردا دڵو گیانی "حەقیقی"چاوەكەم
دەردی بێ دەرمانە عیشقت، دەردی بێ دەرمان بەسە! -حەقیقی-

نا، ئیدی وشەی بەسە لە من نابیسی!! هەرگیز...

مەرگی بەر دەرگاكەی تۆم لە تەختی پاشایەتی لا گەورەترە، تۆ گیان دەبەخشی بە ڕۆحم، من بێ تۆ ڕۆحم مردووە، چ جای لاشەم!

ئەو دەردەی تۆ دەهێنێتە عیادەم من بەڕۆحم سەودای دەكەم

هەربە ئومێدی عەیادەت، بەڵكە جارێ بێتە لام
من، ئەگەر چی بشمرم، پێم خۆشە ئەم بیمارییە-نالی-

هەركەسێكیش مزگێنیی هاتنی تۆم پێ بدا من سەروەتو ماڵی هەمووی بە موژدانە دەدەمێ، چونكە دوای هاتنی تۆ من لە خۆشیدا شاگەشكە دەبم، لە خۆشیدا ڕۆحم دەسپێرم!

بە ڕووخۆشی كە فەرموویە، دەبێ "ناری" عەیادەت كەم
ئەوا مردم لە خۆشیدا، لە خۆشی ئەو نەخۆشینە



# نامە نوریەکان

لـە دوای دوا نامـەم، کە دەکرێ ئەو کات هێشـتا بە دەسـتت نەگەیشـتبێ، چاوەکانم دایانە ئێشو ئازار، تارمایی ڕەش بیناییان داگرتمو لە جیهانی نورەوە بەرەو جیهانی تاریکی بارگەم لێکنا، لە چەند سـاتێکی کەمدا لە یەکێك لە گەورەترین نیعمەتەکانی خودا بێبەش بووم!

ئەوسـا بە تەواوی زانیم جیهانی نورو جیهانی زوڵومات چەند جیاوازن!

ئەوکات زانیم بیناو نابینا هەرگیز چوون یەك نین!

﴿ قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الْأَعْمَىٰ وَالْبَصِيرُ أَمْ هَلْ تَسْتَوِي الظُّلُمَاتُ وَالنُّورُ ﴾ الرعد: ١٦

ئەوکات زانیم خودا بۆچی دەفەرموێت ﴿ أَلَمْ نَجْعَل لَّهُ عَيْنَيْنِ ﴾ البلد: ٨

ئەوکاتەی دنیای ڕوناکم تاریك بوو!

چەند بێ ئاگاین لە نیعمەتەکانی خودا، تا خوداوەند غافلگیرمان نەکاتو لێمان وەرنەگرێتەوە!

دەتوانی ژیانت وێنا بکەی بەبێ نیعمەتی چاو!؟

دەتوانی لە بینینی خۆشەویستانو دۆستانت مەحروم بی؟!

ئیـدی جوانییەکانـی گـەردوون نابینی! بەهـارو پایز لای تۆ چوونیەکە!

نامەی سروەیەک

له بینینی لاپەڕەکانی «قورئان» بێبەش دەبی!

ئای چی ڕوویەك لە ڕوخساری لاپەڕەکانی موصحەف جوانترە؟!

ئەنەس لە باســی دوا دیداری پێغەمبەردا دەفەرموێ «دروودی خــوای لێبێت»: کاتــی ئێمە لە نوێژی نیــوەڕۆدا بووین پەیامبەر پەردەی ژوورەکەی لاداو بە زەردەخەنەوە تەماشای کردین!

ئێمەش لە حەیوەتی دیداری ڕوخساری ئاگامان لە خۆمان نەما، ڕوخساری هێندە جوان بوو!!

دەتگوت پەڕەی موصحەفە! ئیدی ئەوە دوا دیدار بوو!.......

هاوکات ســەرەتای مانگی پیرۆزی ڕەمەزان بوو، دەمێك بوو لە چاوەڕوانیدا دەستەو نەزەر ڕاوەستابووم، بەڵام کاتێ ئەو تەشریفی هێنــا، من نەمتوانی تێر بە چاوەکانم تەماشــای هیلالەکەی بکەم، نەمتوانی بە سورمەی لاپەڕەکانی قورئان دیدەم سورمە ڕێژ بکەم!

گوێبیســتی قورئــان دەبــووم، بەڵام مــن بە تاســەی دیداری لاپەڕەکان بووم، دەمویست ئاوێزانی پیتەکانی ببم!

نەمدەتوانی تەماشــای ڕووناکی بکەم، لــە دیوێکی تاریکا ڕۆژم بەسەر دەبرد! ﴿ وَمَن لَّمْ يَجْعَلِ اللَّهُ لَهُ نُورًا فَمَا لَهُ مِن نُّورٍ ﴾ النور: ٤٠

دەیان ساڵە بەو چاوە دەبینم، لە بەرامبەریدا چیم بۆ سوپاسی خودا کردووە؟!

﴿ قُلْ هُوَ الَّذِي أَنشَأَكُمْ وَجَعَلَ لَكُمُ السَّمْعَ وَالْأَبْصَارَ وَالْأَفْئِدَةَ قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ ﴾ الملك: ٢٣

نەمانتوانی لەو کەمە سوپاسگوزار بین!؟

چاو دوڕیانێکە بۆ دوو مەنزڵ!

ئارەزووو بکەی دەتبا بەرەو ڕەوح و ڕەیحانی بەهەشت!

وە گەر نا بەرەو چاڵو دۆڵەکانی دۆزەخ!

دەتوانی بە فرمێســکەکانی چاوت، گەردنــی خۆت ئازاد بکەی، خوداوەند بڕوانامەی بەهەشتت پێ بدات.

پەیامبەر دەفەرموێ «درودی خوای لێبێت» ســێ کەس چاویان دۆزەخ نابینێ، چاوێك لە ترســی خودا ئەســرینی ڕشتبێ، چاوێك لە پێناوی خودادا پاســەوانی کردبێ، چاوێك بەرامبەر ئەو شتانەی حەرامە پێڵوەکانی داخستوون». معجم الطبرانی-صحیح-

هەروەها دەفەرموێ «ئەوەی لە ترســی خــودا گریابێ ناچێتە دۆزەخ تا شیر نەگەڕێتەوە بۆ گوان»! الترمذی صحیح

وەلێ لەم زەمەنی فیتنەیەدا چۆن چاوەکانمان بپارێزین!!

لە زەمەنێکدا زۆرترین تاوان بە چاو دەکرێت، جلەوی والاکراوەو لەبری سوپاسگوزاری بۆ خودا بۆ تاوانو گوناهو حەرام بەکاردێت!!

مەگەر ئێمەی موسوڵمان فەرمانی خودامان بیرچووە، «قل ﴿ قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ ذَٰلِكَ أَزْكَىٰ لَهُمْ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا يَصْنَعُونَ ﴾ النور: ٣٠

لەگەڵ سورەتی نورا، چۆنین؟ چەند لەو نورە بەهرەمەندین!

محمدی کوڕی واســیع زۆر سەردانی هاوڕێیەکی دەکرد، هەموو جارێ کەنیزەکێك دەرگای بۆ دەکردەوە، ئەویش سەری دادەخستو چــاوی دەنووقانــد، کاتێك کەنیزەکەکە دەگەڕایــەوە بۆلای خاوەن ماڵ، لێی دەپرسی: کێیە؟ ئەویش دەیگوت: هاوڕێ کوێرەکەتە!

وای دەزانی کوێرە!

چونکــە دەیزانــی چاو ئەگەر بەربەســتی ئیمــان نەبێ چەند دژوارە!

کل الحوادث مبداها من النظر ومعظم النار من مستصغر الشر

کم نظرة فتکت فی قلب صاحبها فتك السهام بلا قوس ولا وتر

چونکە نەزەر تیرێکــی ژەهراوییەو دڵو دەروونەکان ژەهراوی دەکات.

دەریای ئیمان لێڵ دەکاتو خونچەی توهرو عەفاف دەوەرێنێ!!

بــەڵام ئــەوەی چاوی بپارێزێ خودا شــیرینی ئیمــان بە دڵو دەرونی دەبەخشێ!

حەســانی کوڕی ئەبی ســینان لــە ڕۆژی جەژنــا پێیان گوت: هەرگیز هێندەی ئەمڕۆ ئافرەتمان نەبینیوە؟!

گوتــی: بەڵام من چــاوم بە یەك ئافــرەت نەکەوتووە! چونکە چاوی خۆی پاراستبوو!

کاتێــك گەڕایەوە ماڵــێ: ژنەکەی لێی پرســی: چەند ئافرەتی جوانت بینی؟!

گوتــی: وەڵلاهی تا گەڕاومەتەوە جگە لە پەنجەکەڵەی دەســتم تەماشای هیچم نەکردووە!

ڕەبیعی کوڕی خوسەیم بەلای کۆمەڵێك ئافرەتا تێپەڕی، هێندە تەماشای زەوی دەکردو خۆی پاراست: ئافرەتەکان وایانزانی کوێرەو لە خودا پاڕانەوە لە کوێری بیانپارێزێ!

ســوفیانی ســەوری لە کۆتایــی وانەکانیدا پێــش ڕۆژی جەژن گوتــی: یەکەمین کارێك کە لە ڕۆژی جەژندا دەیکەین، پاراســتنی چاوەکانمانە لە ڕوانینی حەرام!

ئازیزم: ڕۆژانە هەزاران جار چاوەکانت دەتروکێنی!

لە خۆت پرســیوە چەندیان بــۆ ڕەزامەندی خودایەو چەندیان بە پێچەوانەوە؟!

لە خۆت پرســیوە کە ئایا دەتوانی بەرامبەر بە هەزاران تاوانی ڕۆژانەی چاوت خۆت ئامادەکەی بۆ سزای خودا!

هەوڵدەدەیت ئەو چاوانەی کە دەتەوێت لە ڕۆژی دوایدا خودای گەورەی پێ ببینی بە پاکی ڕایانگریو لە ڕۆژی دوایدا شــەرمەزار نەبــیو بــە شــانازییەوە بە دیدەی پــاكو بێگــەردەوە بۆ خودای خۆشەویستی خۆتی پێ بڕوانی!؟

دەزانی خوداوەند ئاگای لە هەموو تیلەیەکی چاوت هەیە؟!!

﴿ يَعْلَمُ خَائِنَةَ الْأَعْيُنِ وَمَا تُخْفِي الصُّدُورُ ﴾ غافر: ١٩

ع.ش.شێرکۆ

# لەگەڵ سەیدی شاعیردا

شاعیر ناوی سەیید عەبدولقادر سایادەتەوەو ناسراوە بە (سەیید) ساڵی ١٣٠٨ی هەتاوی لە دێی (جەمیان) لە کوردستانی ڕۆژهەڵات لەدایك بووە هاودەمی شاعیرانی گەورەی وەك سەید کامیلی ئیمامیو حەقیقی بووەو خاوەنی زۆر شیعری تەڕو ناسكو جوانە.

### جامی جەم

دڵ لە ئاڵۆزانی زوڵفت بۆچی خاتر جەم نەبێ
بۆتە ئاوێنەی جەماڵی تۆ کە جامی جەم نەبێ
یادی زوڵفی تۆ بە شەوگاری درێژ هاوڕازمە
من هومێدم وایە سایەی قەت لەسەر من کەم نەبێ
ئێستە گەر تۆش لێم نەپرسی جێی گلەو شەکوا نییە
موددەتێکە من لە بیری کەس نەماوم خەم نەبێ
من کە وەستام وەکوو کێوێك لەبەر دەردو خەما
کێوو کوێستان قەت سەری نابێ بە هەورو تەم نەبێ

### زەنجیر

شەو لە من داهات کە هاتی زوڵفەکانت شانەکەی
تا سبەینێ ڕووت لە من دەرکەوتەوە نیشانەکەی
شانە هەروەك من ئەسیری داوی زولفو پەرچەمە
وەك سەفی زەنجیر لە پێ وایە ددانەو دانەکەی
شوێنەواری کۆتو زنجیر لە نێو کیژانی کورد
تۆقی زێڕینی لەئەستۆدا لەپێ پاوانەکەی
ناسرەوم هەر شەو لەبەر بیرو خەیاڵی وردە خاڵ
بیری وردی من کە پێوەندی بە داوو دانەکەی
گوڵ لە نێو بەرگو گەڵای خۆی دابێ جیلوەی جوانترە
بۆیە وا جوانی دەڕازێنێتەوە کۆڵوانەکەی
من مژۆڵم بۆیە پەرژین کردووە بۆ چاوی خۆم
تا حەسارێك بێ لە دەوری وێنە ڕێكو جوانەکەی

(سەیید) ئەوڕۆ شیعرەکانی بوونە نوقڵی مەجلیسان خۆی بەڵام کەس یادی لێ ناکا وەکوو ئەفسانەکەی وەك کتێبێکی موقەددەس دەچێتە سەر تاقەی دڵان گەر لە دوای مەرگی کەسێ چاپێ بکا دیوانەکەی

ئەمیش هۆنراوەیەکی پڕ لە پەندو ئامۆژگارییە

### منداڵی ناعاملاو

دایکو بابی لێ نەزان منداڵی ناسولحاو دەبێ
هیچو پووچ دەردێ لە کار بەدناو دەبێ بێناو دەبێ
زۆر بەناز پەروەردەکردن بۆ مناڵ خێری نییە
گوڵ ئەگەر زۆری بدرێری بێ گومان ناز ئاو دەبێ
چاو ئەگەر فرمێسك ئەڕێژێ دانە دانەی گەوهەرە
زۆری پێ بگری بە ڕێژەو لێڵ دەبێ لێلاو دەبێ
ساردو گەرمی ڕۆژگارێکیش ببینی باشترە
تیغی جەوهەردار بەمانە تیژ دەبێ تێراو دەبێ
گیانە منداڵی هەتیو جەبری زەمان دەیکا بە شت
جا کە کچ بێ شێرەژن دەردێ کە کوڕ بێ پیاو دەبێ
داخەکەم بۆو رووتو قوتانەی بە سەرمای زیندەگی
ئیحتیاجیان یا بە ئاور یا بە تینی تاو دەبێ
کچ کە حەبسی بێ هەمیشە هەر وەکوو تەیری قەفەس
ڕۆژێ دەفڕێ سەردەمێك موحتاجی دانەو ئاو دەبێ
کوڕ کە هەوساری بە دەس خۆی بێ وەکو بارگینی تۆڕ
مانگرو جوتەوەشێنو شێتو ناعاملاو دەبێ
هەر مناڵێك خوێندەوار بێ بۆ ژیان ئامادە بێ
بابی سەربەکڵاو دەبێ دایکیشی مل بە دراو دەبێ

